# گێژاوی ژیان

له هۆنراوەكانی ئوستاد سەعادەتی (حاڵی)

# گێژاوی ژیان

شیعری رێوی و پەلەوەر
بوک و خەسو
کوڕ و بوکی خراو
کفتەی مامە لفتە
حاجی و حاجی ژن
وتووێژی جادوبازێک و شێرە ژنێکی کورد
پارە (پارە روحی رەوانە)
شیربابی
ژن بە ژن
پیاوی دوو ژنە
تریاک و کەڵەشێر
ئارەق و سیگار
بێوەی منالدار
پیاوی تەڵاق خۆر
**شابانی باســـــە** • بە شوێنی ئەم مەبەستانەدا بەشی دووهەمی ئەم کتێبەوە بەرچاو ئەکەوێ •
پێشکەشە بە پیاوان و ئافرەتانی دڵسۆز و رۆشنبیر بە تایبەت کچان و کوڕانی تازە لاو

بچوکتان عەلی سەعادەتی (حاڵی)

سعادتی، علی، ۱۳۳۰ -
گیژاوی ژیان/ له هونراوه کای عولی سه عاده
تی "حالی" .ـــ سنندج: انتشارات کردستان، ۱۳۸۲.
۱۳۹ ص.
ISBN 964-7638-26-1
فهرستنویسی براساس اطلاعات فیپا.
۱.شعر کردی -- ایران -- قرن ۱٤. الف.عنوان.

PIR۳۲۵۶/س۷٤۳س۶۶ | ۸ فا۹/۲۱
۱۳۸۲ | ۵٤۳ک س
۱۳۸۲

کتابخانه‌ملی‌ایران | م۸۲-۱۵۰۶۲

...زی لاوی چو بەری هاتە پێش    بە دوای کاروانا خۆم ئە کەم بە کێش

# گێژاوی ژیان

لە هۆنراوەکانی عەلی سەعادەتی «حاڵی» * چاپی هەوەڵ: ۱۳۸۲

تیراژ: ۳۰۰۰ جەڵد *

چاپخانەی:    * پیت‌چن: ئاشنا، سنە

| نرخی: | شابک: |
|---|---|
| ۸۰۰ تمن | ISBN: |

# ناوەرۆک (فهرست)

به ناوی خوای گەورە

## پێشەکی

خوشک و برایانی دڵسۆز و رۆشنبیر، هەمو ئەزانین هەر مرۆڤێکی خاوەن هەست و خاوەن ویژدان ئەبێ لە بیری ئەوەدا بێ کە فەرهەنگ و کەلەپوری نەتەوەو گەلەکەی لە ناو نەچێ هەروا هەمومان ئەزانین کە رێزمان و رێنوسی کوردی بەشێکی گەورە لە فەرهەنگ و کەلەپوری نەتەوەی کوردە وە ئەیشزانین کە رێزمان و رێنوسی کوردی زۆر دەوڵەمەندە و لە درێژایی مێژودا هونەران، نوسەران، پسپۆران و بلیمەتانی کورد دڵسۆزانە کاری زۆریان لە سەر کردوە و تا ئێستا نەیان هێشتوە ئەم سامان و دەسکەوتە بەنرخە لاوازبێ، نە تەنیا نەیانهێشتوە کزولاوازبێ بەڵکو خزمەتێکی وایان بە رێزمان و رێنوسی کوردی کردوە کە هەتا هەتایە لاواز و

زاییف نابێ، جا بەم بۆنەوە ئەتوانم لە ڕاستیدا بڵێم ڕێنوسی کوردی لە ڕێنوسی تەواوی زمانە پێشکەوتوەکانی دونیا بان‌تر و ڕێک‌وپێک‌ترە، سەرەڕای ئەمەیش ڕێزمانی کوردی لە ڕێزمانی زمانەکانی دیکە کەمتر نیە، کەوایە بێن با پێکەوە ئەم فەرهەنگ و کەلە پورە دەوڵەمەند و بە نرخە بپارێزین، نە تەنیا بیپارێزین بەڵکو زۆرتر گەشە و پەرەی پێ بدەین. هیواداریـن کـە سەربەرز و سەرکەوتو بن.

عەلی سەعادەتی (حاڵی)

## ڕێوی و پەلەوەر

ڕۆژێ ڕێــوی فــێڵەباز نــادوروستی حــیلەساز
بە ئـەڵلا و هـاوار هـاوار پــۆشی جـلی تـۆبەکـار
بــەر مـاڵێکی کـردەشان پرچی لێ کـرد پـەرێشان
تــەسبێحێکی دانــە زل سەد دانـەیی خسـتە مـل
پیسی نەگـریسی گـەرۆڵ چو بۆجەنگەڵێکی چـۆڵ
بە فێڵ و مەکـر و جـادو خێرا دەسـتە و دۆعـا بـو
چاوی پڕ کرد لە ئەسرین نـەیبو بـزە و پـێکەنین
بە زیکر و نـاڵە و گـریان دڵی ئـەکـرد بـە بوریان
زاری ئــەکــرد بـە زاری خوێن لە چـاوی ئـەباری
لە بــن دارێکــی بــەرزا فەوری خۆی دا بە عەرزا
وەکو سـۆفی و مـامۆستا بــەرەو قــیبلە راوەســتا
ئـەتوت شـێخی سـەنعانە خودا نـاس و حـاڵ زانـە
دڵســۆز و بــێ گــونایە جــێگای هــانا و پـەنایە

پــــەلەوەرێکی نـــەزان زۆر هەژار و بـەستەزمان
بەچکەکانی نەخۆش بون دەردەدار و پەرۆش بـون
هەستا زۆر بـە چـالاکـی بـــە دامـاوی و دڵـپاکـی
چو بۆ لای ئـەو بـەدکارە بــۆ لای ئــەو نــالەبارە
وتـــی پشت و پــەناکــەم هیوای دین و دونـیاکـەم
پـــەنام بـــۆ تـــۆ هـــێناوە چـــــارەیێکم نــــەماوە
بـــەچکەکـانم هـــەژارن دامــــــاوو دەردەدارن
تـــۆخوا رو لە خـــوا کــە دەردی ئـــەوان دەوا کـــە
ڕێــــویەلاتەی جـــادوباز بێ بەزەیی کـەڵەک ســاز
دەســـتی خســە گـیرفانی کـــــاغزێکی دەرهــــانی
وتـــــی ئـــەمە دۆعـــایە دۆعــــای دەرد و شـیفایە
فـــــەرمو بـــیکەمەملت گەردنی جـوان و شـلت
ئــــیتر هــــەتا هـــەتایە هـــــەتا دونـــیا دونـــیایە
هاو دەمی خۆشی و ژینن دەرد و بـــــەڵا نـــــابینن

پـەلەوەری لێ قـەوماو — بـەدبەختی هـەڵخڵەتاو
مـلی بـردە بـەر دەمـی — وەستا بـە خـاتر جـەمی
مـامەرێوی تـاوانـبار — بـێ ئـیمانی سـتەمکار
پـــری‌دا ئـەو بـێچارە — هـاوار بـۆ ئـەو هـەژارە
بـە تـوندی مـلی بادا — ئـەوی بـەبای فـەنادا
بـەنامەردی و غـەدداری — کردی بە زەهـری مـاری
ئـەمجارە بـەچکەکـانی — بـە برسی و پـەرێشانی
نـەمان بـە سـەردارەوە — هـەمو کـەوتنە خـوارەوە
مام رێوی هەموی کوشتن — بە جارێ خـوێنی رشـتن
رێـوی دڵـرەقی خـوێنمژ — زاڵـمی بـێ تـاوان کـوژ
لە لیـباسی دیـنداری — دەسـتی‌دا سـتەمکاری
لە لیـباسی پـیاو خـاسان — ئـەو پـەلەوەرەی تـاسان
گـەلی ئـازاو قـارەمان — ئـامان دەستم بـە دامـان
ژیـر و زانـا و وریـا بـن — پیاوی هەردوو دونیا بـن

هەتاکو ئاخر نەفەس ژیربن مەخلەتێن بۆکەس

«حاڵی» ئەم دەنگ و باسە هەموی مەڵێ وا خاسە

باری دونیا ناجۆرە ناحاڵی تەواو زۆرە

حەق بۆ ناحاڵی تاڵە حاڵی بونی موحاڵە

ئیتر خوداتان لەگەڵ دور بن لە پیاوی دەغەڵ

* * *

## خەسوی خراو: بوک و خەسو

شـــیرین بـــوکێکی چـاک و چـالاک بـو

ژیر و وریـا بـو بـێ عـەیب و پـاک بـو

ئازا و بە هەڵمەت زۆر زەحمەتکێش بو

بێ دەرد و ئـازار بـێ رەنـج و ئـێش بـو

پاک و شەرمین و دوروست و راس بـو

وەکـــو فـــریشتە دڵـــپاک و خـــاس بـو

شـــیرین کـوڕێک و کـیژێ جـوانـی بـو

هـــەرکامیان ئـــارام بـــەخشی گـیانی بـو

نـــوری چـــاوی بـــون ئـــازاد و نـــەرمین

رۆڵەی شیرین بون پڕ حـــەیا و شـــەرمین

روحـــی رەوان و مـــایەی ژیـــنی بـــون

هـــیوا و ئـــومیدی دونـــیا و دیـنی بـون

داخـــەکـــەم شـــیرین خـــەسوییێکی بـو

شـــــەیتانیش ســـــەری لێ دەرنـــەدەچو

زاڵمی غەددار پەتیارەی سەرمەست
دەستی شەیتانی لە پشتەو ئەبەست
خەسوی هەر ڕۆژێ لە سەر نەزمێ بو
هەرتاوێ لە بیر بەزم و ڕەزمێ بو
ئەیوت قەومینە ئەمن لام وایە
شیرینی بوکم ئاگری ژێر کایە
هەرچەندە شیرین زاهیری چاکە
بەڵام دەرون و قەلبی ناپاکە
هەرچەن بە ڕواڵەت پاک و شەرمینە
بەڵام دەرونی پڕیە لە کینە
سەرئەنجام خەسو بۆ ماوی دە ساڵ
شیرینی مۆڵەت نەدەدا لە ماڵ
بە زەخت و ئازار دەردەداری کرد
بەداوی مەینەت گرفتاری کرد

شوەکەی شیرین سادە و نەفام بو
دڵپاک و هەزار گێژ و عەوام بو
دایکی پێی ئەوت ڕۆڵەی دڵبەندم
دار عاسای دەستم تەنیا فەرزەندم
شیرینی ژنت کز و بیمارە
دەردی کاریە ئەو دەغەزارە
وتی دایەگیان قسەکەت ڕاسە
با شیرین دەرکەین دایە وا خاسە
سەرئەنجام کوڕی نەفام و خەسو
شیرینیان دەرکرد بە زۆری بازو
ئەویان بێ بەش کرد لە ماڵ و مناڵی
روی کردە سارا بە دەستی خاڵی
منداڵەکانی تەنیا بە جێمان
ئەگریا و ئەیوت دەردی بێ دەرمان

ئـــەیوت کـــوائازادکـــوانـــێ نـــەرمینم
لە کـــوێن ســـەرمایەی حـــەیات و ژیـنم
ئـــــازاد و نـــــەرمین مـــــن دەردەدارم
بـــە قـــوربانتان بـــێ لاشـــەی بـــیمارم
قـــــەلبم بـــۆ ئـــێوە هـــابو بـــە کـــەباب
جەرگم لەت لەتە وەک کـۆتەی قـەساب
زامـــــم هـــاتە ســۆ هـــاوار بـــە مـــاڵم
هـــاوار بـــە جـــەسەی کـــورەی زوخـــاڵم
هـــا بـــو بـــە قـــەقنەس لاشـــەی زەبـونم
دیـســـان هـــاتە کـــوڵ دیـکـــی دەرونـــم
شـــەرتە دوای ئـــێوە بـــبم بـــە عـــەوداڵ
بـــبم بـــە مـــەجنون دێـــوانـــەی بـێ حـــاڵ
عـــاسا وکـــەشکۆڵی بکـــەم بـــە یـــارم
بـــیکەم بـــە هـــاودەم لاشـــەی بـــیمارم

ئـــازاد و نـــەرمین بـــەو خـــوا قـــەسەم
بـــێ ئـــێوە نـــاژیم هـــاوار بـــە جـەسەم
خـــوایـــە بـە عـەشقی رەسـولی ئـەمین
بـــە فـــرمێسکی گـەش ئـازاد و نـەرمین
خـــەسوم زوبـنمرێ عـومری بـێ بـەرباد
بـــا بـــچمە و بـــۆ لای نـەرمین و ئـازاد
سـەرئەنجام شـیرین دوای گـریە و زاری
بێ هـۆش بـو جـەستەی کـز و بـیماری
لە خـــەویا وتـــیان خـــەسوت نـــەماوە
شـــیرین بـــە شـــادی هـــەستاوە پـــاوە
گـــەڕاوە بـــۆ مـــاڵ بـــە یـــەک هـەناسە
بـــینی خـــەوەکـــەی دوروست و راسـە
خـــــودای نـــەرمین و ئـــازادی هـــەژار
خـــەسوی رەق کـرد بـووە کـورە قـەمار

سەر ئەنجام بردیان خستیانە ناو چاڵ
ئیمجارە شیرین هاتەوە سەر حاڵ
شیرین ئەترسا زیندو بێتەوە
خوا نەکەردە هەڵ بسێتەوە
ڕۆژی جومعە بو شیرینی نازدار
چو بۆ سەر قەبری خەسوی ستەمکار
بە ترس و وەحشەت بە دەم بەندەوە
بەم جۆرە خەسوی ئەلاواندەو
خەسو دور کەوتی لە خزم و لە کەس
فیدای قابیزبم زوانتی بردە بەس
ئازاد و نەرمین دڵیان لێت ئێشا
دەستی قابیز خۆش کە گیانتی کێشا
ئەبێ هیوامان تەنیا خوا بێ
مەبادا کۆچت بەرەو دوا بێ

فیدای ئەو خاکەم باڵاتی پۆشی
دوای تۆ هەمومان کەوتینە خۆشی
یا خوا سەلا سیل باڵا پۆشت بێ
کونجی جەهەننەم جێگای خۆشت بێ
یا خوا جەهەننم هەر ئاوەدان بێ
خەسوم هەمیشە لەوێ زیندان بێ
ئەترسم مار و دوو پشکی دۆزەخ
لە ترسی خەسوم راکەن بۆ بەرزەخ
خوایە رەحمت بێ بۆ ئەهلی عەزاب
خەسوم نیانکا بە جوجە کەباب
ئەهلی جەهەننەم لە ترس و بیمە
خەسوم نەیانکا بە کفتە و قیمە
برام ئازیزم ئەم کارە ساتە
ئامۆژگاریە دیاری و سەوقاتە
برام ئازیزم خوا خۆی ئەزانێ
هەر کەسێ تێکدا ماڵ و خێزانێ

فــــیتنەیە فــــیتنەی ئــاخر زەمــانە
خـــــۆت بــــپارێزە دەســـمە دامــانە
نــــازی مــنداڵان قــەت مــەشێوێنە
تــفکە لە شــەیتان وازیــان لێ بێنە
مــــنداڵ بـــێ دایک ژیــنی بــەتاڵە
دایک ســـتون و کــۆڵەکــەی مــاڵە
منداڵی بێ دایک سەر گـەردان ئـەبێ
وێـڵی کـۆڵان و سـەر هـەردان ئـەبێ
ئـــەبێتە لاتــــی کــوچە و خــیابان
ئـەبێتە وێــڵ گـەرد دەشت و بیابان
حاڵی خێر خـوازی کـوردی هـەژارە
هــەتیویان مــەخەن باریان زۆر لارە
یا خـوا هـیچ کـەسێ بـاری لار نـەبێ
بــە دەســـتی زاڵــم گــرفتار نــەبێ

xxx

## کوڕو بوکی خراو

بــرام گــوێ بگـــره بـۆ ئـەم سـەرهاتە
ئـــــامۆژگاریە دەرســـــە ســــەوقاتە
مــیناخانم و ئــاغای شـێخ مــەحموو
مـــاوەی چـــەندین سـال منالیان نـەبو
پــەنایان بـــردە ســەدان شـــێخ و پـیر
ســــەدان پــزشکی فـــیلسوف و ژیــر
چـــارەنوس وابـو سـەرئەنجام یـەزدان
کـــوڕێکی جــوان و خـــرپنی پــێدان
بـــو بـەزەماوەند هـەڵپەڕکێ و خـۆشی
نـــوقڵ و شــــیرینی دونـــیای داپـۆشی
ئـــاشپەز ئــاوگۆشتی هـــاوردە ســـەما
رانـــــە مـــریشکیان ئـــەبرد بـــە دەمــا

مـــــیوه و شـــــیرینی له هـــــەزار لاوه
بـــــه چـــــەپڵە ڕێـــــزان بـــــڵاوکراوه
نـــــاویان نـــــا ئـــــومید ئـــــومیدی نـــــازار
بـــــەو هـــــیوایـــــە بـــــون نـــــەبینێ ئـــــازار
خـــــزمەتکاری بـــــون بـــــە ڕۆژو شـــــەوا
ڕۆحـــــیان دا ئـــــەنا له ژێـــــر پـــــای ئـــــەوا
ســـــەرئەنجام له نـــــاو نـــــازی شـــــاهانه
پـــــەروەردە کـــــرا ئـــــومید تـــــاقانه
گـــــەوره بـــــو ژنـــــیان خـــــاستگاری کـــــرد
کـــــیژێکی جـــــوانـــــیان بـــــۆی دیـــــاری کـــــرد
بـــــو بـــــه زەمـــــاوەند شـــــادی و هـــــەڵپەڕین
گـــــۆرانـــــی و چـــــەپڵە ســـــەماو پـــــێکەنین
لۆتـــــی ئـــــەیکوتا له پـــــای زەمـــــاوەند
ئـــــەیخسته لەرزە کـــــێوی دەمـــــاوەند

دەهـۆڵ و زورنـا و کـەرەنا و شـەیپور
شمشاڵ و ئـۆرگ و ئـاوازە و سـەمتور
عـالەمی کـەرکرد دەنگـی هـەیا هـو
مـنداڵ و گـەورە هـەڵپەرکێیان بـو
بـو بـە رەشـبەڵەک لە هـەزار لاوە
ئـەتوت مـەحشەرە و عـالەم هـەستاوە
ئـەمجار تـەواو بـو هـەڵپەڕکێ و داوا
بـوک چـو بۆ مـاڵی خـەزورە و زاوا
شێخ مەحموو ماڵ و مـوڵک و سـامانی
بـەخشی بـە ئـومید ئـارامـی گـیانی
بـە بـێ قـەید و بـەند بـە بێ بـەهانە
هەموی بۆ سەبت کـرد لە دەفـتەرخـانە
شـێخ نـەیدەزانـی چـارەنوس چـۆنە
چلۆن سور ئەخوا ئـەم چـەرخـە کـۆنە

لەو کاتە عومری مینا و شێخ مەحموو
لام وایە نزیک هەشتا و دوو ساڵ بو
لە پاش چەن مانگێ بوکی کاڵ و خام
وتی بە ئومید تاقانەی نەفام
دایک و بابت زۆر قیزاوی و پیرن
دایم نەخۆش و زار و زویرن
ئێمە جەوانین ژیانمان ئەوێ
جەوان لەگەڵ پیر قەت یەک ناکەوێ
پیر ئەگەر نەمرێ ئەبێ دەرکرێ
دایکیشم وای کرد خوا بیگرێ
لە کاتی پیری و پایانی ژیان
تەوبەی لێ ئەکەین بە دڵ و بەگیان
دڵ مەدە بە دڵ ئومید تاقانە
بێ با دەریانکەین مەگرە بەهانە

ئومید تاقانەی بێ دینی نەفام
جێی تف و لەعنەت هەمو خاس و عام

بە بۆنەی خانم بە ناحیسابی
دەستیدا شۆری لە دایک و بابی

وتی خانم گیان قسەکەت راسە
بێ با دەریانکەین بەخوا وا خاسە

سەرئەنجام بوک و کوڕی ناحاڵی
ئەوانیان دەرکرد بە دەستی خاڵی

بێبەشیان کردن لە ماڵ و سامان
ئاخر زەمانە ئامان سەد ئامان

ئاخر خێر خوازێ پابەندی ویجدان
بردیانی لە بۆ سەرای ساڵمەندان

خێرەومەن نانێ وشکیان پێ ئەدان
چۆن قەبوڵ ئەکەی ئەم کارە خودا

ئـــومیدیش لەگـــەڵ خـــانمی بـــەدکار
عـەیش و نـۆشیانە هـاوار سـەد هـاوار
خـــوایـــە قـەبوڵی نـەکـەی ئـەم کـارە
ریســـوا کــە ریســوا هــەرچــی زۆردارە
خـــوا حـەق سێنە حـەق نـا فـەوتێنێ
حــــــەقی هـــەرکەسێ ئـــەبێ بســـتێنێ
ئەڵێن شێخ مەحموویش بـۆ بـابی وابـو
بـــــاوکی دامـــاوی لێـــی نـــارەزا بـــو
چـــۆن بـــابی دەرکـــرد وەهـــا دەرکـرا
مـــــاڵ و ســـــامانی بـــــە فـــیرۆ بـــرا
قـەسەم بـەو خـوایـە کـە بـێ هـاوتایە
چـــارەی ئـومیدیش سـەرئەنجام وایـە
گـــرفتار ئـــەبێ بـــە دەسـتی نـاکـەس
رەحمی پێ ناکا خـودای فـەریاد ڕەس

بــرام بــە خــودای کــارسازی کــاران
پشت و پــەناهی دەســتەی هــەژاران

هەرکەسێ دایکــی لێــی دڵ ئــێشاو بــێ
یــا خــۆ بــۆ بـابی پیاوێ خـراو بـێ

قـەت خـێر و خـۆشی نـابینێ بـە چـاو
هــــەتا هــــەتایە دامــــاوە دامــــاو

حـاڵی خـێر خـوازی خـەڵکی هـەژارە
ئــازاریــان مــەدەن خــودا قــەهارە

# کفتەی مامە لفتە

نۆکەر بێ هەست و بیرە　　چڵکاوخۆر و ئەجیرە

قولۆرە کەللەپوکە　　وەکو قالۆرە سوکە

چەماغدار و نەزانە　　بێ عەقڵ و بێ وێژدانە

دارە دەسە هەلوکە　　سوکە سەرە مەهتوکە

بێ فەرهەنگ و نەفامە　　دوژمنی خاس و عامە

خەریکی چڵپ و لێسە　　زۆر نەوسن و چڵێسە

بۆ تاقە عەیش و نۆشێ　　خۆی و باوکی ئەفرۆشێ

بە بێ ئەرباب ناوێرێ　　سەر لە قاپۆڕ دەر بێرێ

ئەرباب بە شەق ئەینێرێ　　بە شەیتانی ئەسپێرێ

چڵکا و خۆری ئەربابە　　دینی گۆشت و کەبابە

تەسلیم و جان فیدایە　　ئاغا لە جێی خودایە

حەتتا رۆژ و زەکاتی　　حەج و نوێژ و خێراتی

تەواوی بۆ ئاغایە　　هەرچی ئەکا ریایە

بەڵام بەو تاقە خوایە ئاغاکەیشی هەروایە
چون ئەگەر ئاغا خاس بێ دڵسۆز و خودا ناس بێ
پیاوەکەیشی چاک ئەبێ دروسکار و پاک ئەبێ
پەس گوناى هەردوویانە شەرعیە ئەم بەیانە
چونکو بە تەنیا دەسێ چەپڵە لێ نادا کەسێ
خەڵکی ئەگەر راپەڕێ لە بۆ خەبات و شەڕێ
هەوڵ ئاغا دا پاچێ نۆکەر لە دەس دەر ناچێ
برام نوکەری عارە ئاکامی ژاری مارە
با چەوریش بێ پلاوی شەحم و لەحم و چلاوی
بەڵام بێ قەدر و رێزە وەکو حەیوانی دێزە
پێی ئەدا مامە لفتە گرتک و قیمە و کفتە
بلام ئەگری هەوساری ئەیکاتە زەهری ماری
بۆ راسایی ئەم واتە گۆی بدە بەم سەرهاتە
چوم بۆلای مامە ساڵە دیم زەخمار و بێ حاڵە

کاتی مەرگ و گیان کێشان  بەر بوە ئاخ هەڵ کێشان
وتی خوایِ بانی سەر  روم رەش بێ خاکم بەسەر
رۆڵەی خەڵکی بێ تاوان  هەتیوم خست فراوان
بۆیە منداڵەکانم  ئارامی روح و گیانم
هەتیو کەوتن بە جارێ  خەم لە رویان ئەبارێ
بۆیە خاتەی خێزانم  هیوای مان و ژیانم
بێوە ژن و رەش پۆشە  خەفەتبار و پەرۆشە
ئاخۆ دوای من خاتە  کێ بیخوا وەک تەماتە
کە وەختێ گیانی دەرچو  ئاوا وەسیەتی فەرمو
نانی وشکی رەحمەتە  کفتە و قیمە زەحمەتە
قەت مەیخو تاڵ و تفتە  کفتەکەی مامە لفتە
حاڵی کۆتاکە باسە  هەموی مەڵی وا خاساە
ئیتر خوداتان لەگەڵ  دوربن لە پیاوی چەپەڵ

* * *

## حاجی و حاجی ژن

بــــرای دڵســۆز و ژیــرم    هــاو ڕازی فــیکر و بــیرم
گــۆی بگــره بــۆ بــه‌یانم    ئـــارامــی روح و گــیانم
بــه‌ڵی کــاتی بــه‌هار بــو    فــه‌سڵی گــوڵ و گــوڵزار بــو
دیـــم ژنــێکی تــازه‌لاو    شۆخ و شه‌نگ و لێ قه‌وماو
عومری له هــه‌ژده ســاڵ بــو    نه‌و ڕه‌س بو هێشتا کاڵ بــو
پاک و بێ عه‌یب و راس بو    وه‌کــو فــریشته خــاس بــو
هات بــۆ سکــاڵا و شکــات    ووتــی کــاکــه تــۆ خــودات
گــۆی بگــره بــۆ بــه‌یانم    بـــۆ ســـه‌رهاتی ژیـــانم
من منداڵ بوم زۆر خام بوم    بـــێ ســـه‌واد و نــه‌فام بــوم
بــاوکیشم زۆر نــه‌دار بــو    قــه‌رزار بــو زۆر هــه‌ژار بــو
پــیاوی حـــاجی فــه‌تۆ بــو    بــێچاره و ڕه‌نــجه ڕۆ بــو
بـــه بـــۆنه‌ی نــاعیلاجی    مــنی فــرۆشت بــه حــاجی

بـــه زۆری دار و تـــێلا دامـیه حـاجی فـه‌تحوڵلا
ئـــه‌م کـاره کـاری زۆره نـــادوروست و نـاجۆره
ئـیزدیواج کـه‌ی وه‌هـایه ئـــه‌م کـــاره ناڕه‌وایـه
کـــولکه مـه‌لا نـه‌زانـه پـوڵه‌کـی و بـێ ئـیمانه
چـۆن مـنی‌دا بـه م‌روسـه ئـه‌م شـه‌رعه کـه‌ی دروسـه
ئـــه‌مه کـاری عـه‌وامـه حـاجی له جـێی باوامـه
خـوای خـاوه رو خـۆرئاوا چۆن کـچ ئـه‌درێ بـه بـاوا
پـــیغه‌مبه‌ری مـــه‌دینه کـه‌ی ئـه‌مه یـاسای دیـنه
ئـــه‌مه ئـــایینی پـــوڵه شـــه‌رع بـۆ بـنی قـوڵه
له پـــاش گـریان و زاری شـــیوه‌ن و بـــێ‌قه‌راری
ووتـــی بـــرای شـیرینم ئـوستادی دونـیا و دیـنم
گـۆی بگـره بـۆ بـه‌یانم ئـــارامـی روح و گـیانم
حـاجی فـه‌تۆ مـه‌شهوره بـێ دیـن و له خـوا دووره
تـه‌مه‌نی یـه‌ک سـه‌د سـاڵه له رزۆکـه زۆر بـێ حـاڵه

بیماره ، دەردەداره نەخۆشه دەغەزاره
پیرو فەرتوت و دێزه لار و گێر و بێ هێزه
سەراپای چرچ و لۆچه چاوە ڕێی مەرگ و کۆچه
تف لە چر و چاویه کز و ریپۆقاویه
گۆیشی کپ و گرانه خاس نابیسێ ویرانه
کاتی ساز و بەرگیه کلکە لەقێی مەرگیه
پشتی وەکو گۆچانه لە رزۆک و بێ وچانه
مرخەی هەروەکو بۆقه جا فەرمو لێی مەتۆقه
چرچ و لۆچی لاملی گۆیچکەی سیسەڵ و زلی
گۆیچکە نیه کابوسه لاستیکی ئوتوبوسه
سەریشی چاڵ و چۆڵه لار و گێرو گەرۆڵه
کولانەی کێچ و رشکه جێگای مشک و دوو پشکه
سیخە سیخی هەناسەی مڵچە مڵچی سەر کاسەی
قیزاوی و خەتەرناکە زۆر بۆگەن و ناپاکه

عــــیفریتە وەحشــــەتناکــە تــــەنیا مــردن بۆی چــاکــە
خـــــــەوتنیشی نـــــاجۆرە هـــەروەکـــو تـــەراکـــتۆرە
وەخـــــتێ ئـــەیخاتە نـــۆرە زیـــــل و بـــەمی زۆر زۆرە
هـــەروەکـــو خشـــەی مـارە هـــەناسەی ئــەو پـــەتیارە
جارجـاریش وەک دەهـۆڵە هـــەناسەی ئـــەو گـــەرۆڵە
کـــاکـــە ئـــیمانم نـــەچێ لە بـۆرەی ورچـیش ئـەچێ
چل ساڵە دەسی ئـەلەرزێ هـەرتاوێ شـێوە و تـەرزێ
عـــیزرائـــیل لێـی نـاپرسێ وا دیــــــارە لێ ئـــــەترسێ
مــاباقی عـــەیب و عـاری ســـــیفاتی نـــالە بـــاری
روم نـــــیە بـیلێم کـــاکـــە چـــون فـرە وەحشـەتناکـە
دەک خـەجاڵەت بێ حاجی بـــۆ خـــۆی و ئـیزدیواجـی
بـــرام ئـــەم جـــۆرە کـــارە ئـــــەم ئـیشە نـــالە بـــارە
ئـــــاکـــــامی نـــەزانـــینە نـــەزان سـوک و بـــێدینە
کـــە وایـــە کـوردی دامـاو خوشک و برای لێ قـەوماو

دەرسەکانت بخۆێنە شیرانە خۆت بنوێنە
ئیتر حاجی پولاوی کولکە مەلای فێلاوی
ناتوانن بێنە دەرتان کلاو بنێنە سەرتان
فەرهەنگ و دەرک و زانین چرایە بۆ دونیا و دین
هەرکەسی بێ سەوادە دین و ژینی بەربادە
حالی بە سیە حیکایەت دەردە دڵ و شکایەت
خودا حافیز ماڵ ئاوا دور بن لە جەنگ و داوا

XXX

## وتو وێژی جادوبازێک و ئافرەتێکی کورد

ڕۆژێ لە ڕۆژان پــیاوێ جــادوباز
فێڵاوی و دەس بڕ وریا و کەڵەک ساز
هــەستا چــو بۆ لای ئـافرەتێکی لاو
بــەو هــیوایــە بــو کــە بیخاتە داو
بــە زمــانی لوسی و چــاخان و درۆ
لە گــەڵیا کــەوتە قســەو گــوفتوگۆ
ئــێستا گــوێ بگــرن لەم گـوفتوگۆیە
تــا بــاش بــزانــن جــادو درۆیــە

### قسەی جادو بازەکە رو بە ئافرەتە کوردەکە

ســڵاو کــوردە ژن لاو چــاکــی دڵپاک
فریشتەی ڕەحمەت گەوهەری ژێر خاک

شـــۆخی دڵـپاکـی شـەرمین و سـەنگین

شـــۆرە لاوی کـــورد ســـەراپـا رەنگـین

ئـــافرەتی کـــوێستان شـــێری کـــۆساران

ڕۆڵـــەی کـــوردستان شـــای وەفـاداران

بـــەڵی بـــۆگـــەلت چـــرای رونـــاکـــی

بـــەڵام داخـــەکـــەم ســـادە و دڵـپاکـــی

گـــوێ بگـــرە بـا بـاش ڕێـنمونیت کـەم

تـــا رزگـــارت کـــەم لە پـــەژارە و خـەم

وەڵامی ئافرەتە کوردەکە

کاکی نوشتە نوس پێم بڵی خاسە

مەبەستت چیە لەم قسـە و بـاسە

بەڵی دڵپاکم بەڵام سادە نیم

کوردم بێ هەست و بێ ئیرادە نیم

مەبەستت چیە فەرمو بیفەرمو

بۆمی بەیان کە خێرا زوبە زو

## قسەی جادوبازەکە

من جادوبازو گەورە رەماڵم

جەففار و حاڵزان مەعلومە حاڵم

دێو و درنجت بۆیە خسیر ئەکەم

جینن و عیفریتت بۆ زەنجیر ئەکەم

ئەرواحی پاک و فریشتە و پەری

خزمەتکار من بێ دەردیسەری

بە دۆعا و ئەفسون بەرد ئەکەم بە دوڕ

بە نوشتە و جادو کچ ئەکەم بە کوڕ

نوشتە و تەلیسم و چاوەزار ئەکەم

ئافرەتی نەزۆک منداڵدار ئەکەم

بە خوێنی مشک و کەڵەبابی کوێر

شەمشەمەکوێرە یا عەنتەری نێر

ئەنوسم دۆعای چەورو شیرینی

هەتا هەتایە تاڵی نابینی

بە تاسنانەوە و هێزی چاوەزار

ئەتان پارێزم لە دەرد و ئازار

قورئان لە چاڵ نان نوشتە سوتاندن

ویفق لە ماڵ نان ئایەت کولاندن

ئـیرسی بـا پـیرمە بـۆم بـە جـێ مـاوە

لە لایـــەن خـــواوە پـێمان دراوە

مـــن غـــەیبەزان و ئـــایەندە بـینم

من مشکوڵ گوشای روی سـەرزەمینم

هـــەرکەسێ پـوڵ و پـارەم پـێ بـدات

بە نوشتە و جـادوم ئـەگـا بـە ئـاوات

شۆخە ژن ئەتوێش باش بـاش بـزانـە

ئـەبێ پـێشکەش کـەی سـەرقەڵەمانە

ئـــیتر بـــزانـــە هـــەتا هـــەتایە

زیـــان نـــابینی لە ســەر دونـــیایە

## دیسانەوە وەڵامی کوردە ژنەکە بۆ جادوبازەکە

کاکی جادوباز بەو تاقە خوایە
کار و فرمانت زۆر ناڕەوایە
خۆیشت ئەزانی نوشتە سوتاندن
ئایەت لە چاڵ نان دۆعا کوڵاندن
خیلافی ئام و عەقڵ و ویژدانە
خیلافی شەرع و دین و قورئانە
ئایەتی قورئان جێی فەخر و کەماڵ
مەگەر مردوە کە ئەینێتە چاڵ
مەگەر خۆراکە تۆ ئەیکوڵێنی
یا کۆتەرەیەکە ئەیسوتێنی
تەلیسم و جادویش هەرچیکت پێیە
باش‌باش ئەزانی هەموی درۆیە

گەر غەیب ئەزانی گـەدایـی بـەسە

ئـەم جـۆرە کـارە کـاری نـاکـەسە

خۆ ئەم ژێر خاکە کـانی گـەوهەرە

زێـر و زیـوەرە هـەمـوی یـەکسـەر

دەریـان بـهێنە لە ژێـر ئـەم خـاکـە

خەرجی کە بۆ خۆت ئەو رزقە پاکە

ئـیتر بـەسیەتی چـاخان سـازمەکـە

هــەمانەی درۆت لێـرە واز مـەکـە

دیسانەوە قسەی جادوبازەکە رو بە ئافرەتە کوردەکە

دادەی ئــازیزم نــوری دوو چــاوم

خوشکی خۆشەویست هێزی هەناوم

مەگەر نازانی سەدان شێخ و پیر
ئەوانیش هەمو دێو ئەکەن یەخسیر
هەمو خەریکی ئەم جۆرە کارەن
دایم لە بیری ئەم کارو بارەن
وەرە تەسلیم بە تۆ کەم دڵرەق بە
پارەمان ئەوێ کەم کەللەشەق بە

دیسانەوە وەڵامی ئافرەتەکوردەکە

کاکی جادوباز ئەتۆ بزانە
بەو خوایە قەسەم کەبێ مەکانە
رەممال جادوباز با شێخ و پیر بێ
با لە زاهیر دا پیری دەسگیر بێ

ریسوا و رو ڕەشی هەر دوو دونیایە

خــــەجاڵەت بــارە هــەتا هــەتایە

بـــەسیە کـــۆتاکــە درۆو دەلەســـە

هەمانەت جـەم کـە چـاخاندن بـەسە

## دیسانەوە قسەی جادوبازەکە

ئەی بێ بـەزەیی ئـافرەتی دڵـرەق

ناحاڵی عـەوام شێتی کـەللەشەق

ئەبێ تەسلیم بی بە نوشتە و جادو

دوایـــن وەڵامت بـێژە زو بـە زو

ئەگینا ئێستا بە خودای بـێ کـەس

ئاگرت ئەدەم ئەتکەم بە قـەقنەس

زو بە زو ئـەتدەم بـە بـای فـەنادا
تۆز و گـەردیشت ئـەدەم بـە بـادا

## دیسانەوە وەڵامی ئافرەتە کوردەکە

ئەرێ جادوگەر جەردەی کەڵەکساز
کانی درۆو فـێڵ گـەوجی جـادوباز
خـوێری بـێ هـونەر شـێتی پـەتیارە
کەم چـاخان بکـە کـەی ئـەمە کـارە
عەقڵ و مەنتیق و قورئان و حەدیس
تۆ مەحکوم ئەکەن شاگردی ئیبلیس
خەڵکی بێ سـەواد هـەڵ مـەخڵەتێنە
پـیشە و کـار فـێربە بـەسیە واز بـێنە

خۆت باش ئەزانی لات بێ گومانە
چی ئەڵێ هەموی درۆو چاخانە
خۆیشت ئەزانی هەمو ئەمانە
خیلافی دین و عەقڵ و ویجدانە
هەستە مەردانە بێ دەردیسەری
زو دەس هەڵگرە لە جادوگەری
کارێ فرمانێ بۆ خۆت پەیدا کە
بەسیە کەم خۆت وگەلت ریسوا کە

## دواین قسەی جادوبازەکە ڕو بە ئافرەتە کوردەکە

شۆخە ژن مەردی شاخ و کۆساران
سەرمایەی کوردان ئاسکی نساران

پڕ شەرم و حەیا لاو چاکی شەرمین

خاوەنی هەست و باوەڕ و زانین

لە ئامۆژگاریت زۆر منەت بارم

هەتا هەتایە سوپاسگوزارم

ئیتر ڕەمماڵی و جەففاری ناکەم

فێڵ و تەڵەکە و مەککاری ناکەم

چاخان و درۆو سەر قەڵەمانە

ئیتر تەرک ئەکەم مەرد و مەردانە

تەو بە سەد تەوبە لە نوشتە و جادو

تەوبە لە گونا و درۆی رابردو

بەڵام چی بکەم بە دەستی خواوە

حەقی زۆر کەسم هەیە بەلاوە

درۆ بە خەروار چاخانْ بە تەغار
تەحوێلم داوە هەزار بە هەزار
تۆبە سەد تۆبە باری خودایە
ئیتر وا ناکم هەتا هەتایە
خوا حافیز بێ ئافرەتی نازار
مامۆستای بەڕیز ئامۆژگاری کار
بە ڕاستی کوردی زانا و بە دینی
ڕۆڵەی قارەمان سەلاحەددینی
ئافەرین لە تۆ هەزار ئافەرین
لاو چاکی شیرین دڵپاکی شەرمین
حاڵی کۆتاکە ئەم دەنگ و باسە
ناحاڵی زۆرە بۆ خۆت وا خاسە

چونکه حەق لە لای ناکەس بە تاڵە

هەنگوین لە دەمیا ژاراوی و تاڵە

خـــودا حـافیز و مـاڵئاوا «حـاڵی»

یـا خـوا نـەبینی کـەس بـە بـەتاڵی

❊ ❊ ❊

## پاره

ئەی خودای ڕۆژ و شەوێ   بێ پارە کەس نایەوێ
تەنانەت مەلای مزگەوت   ناچێ بۆلای بە هەڵکەوت
بۆ تەسدیقی ئەم باسە   باسی کامینە خاسە
دوێنێ بە عەزمی دیدار   چوم بۆلای مینەنەدار
دیم شەڕ و کارزارە   هەرایە گیر و دارە
مینە و ژن و منداڵی   لە موحتاجی و بێ حاڵی
گشتیان ئەیاندا لە یەک   بە مشت و بڵتە و کوتەک
مینە ئەیدا لە خاتە   لە سەر چێشتی تەماتە
خاتە ئەیدا لە مینە   لە سەر سێفەزەمینە
خولە بلەی کردە کێش   لە سەر نیسکێنە و بروێش
زاراگوڵاڵەی ناژێر   لە سەر یەک تیکە پەنێر
شێرە و ڕێحانە چەتون   باش بو لە ماڵا نەبون
ئەنا مەحشەر ئەخێزا   ئەبو بە ڕۆ مەڵ غەزا

ترسام خاتە نیسکێنە  قەیچی کا گوێچکەی مینە

ناچار مینەم هێنا دەر  چوێن بۆ ماڵی شێخ سەفەر

حاجی شێخ زۆر پوڵدار بو  سەرمایەداری شار بو

دیمان ژن و منداڵی  بە ئارامی و خۆشحاڵی

خەریکی عەیش و نۆشن  لە شادییا سەر خۆشن

بێ دەنگ و تێر و تۆخن  پۆشتە و پەرداخ و شۆخن

زۆر ئارام و سەر حاڵن  وەکو فریشتەی ماڵن

حاجی شێخ ووتی مینە  ماڵی دونیا شیرینە

ئیمجار بە دەم بەندەوە  ئەم شێعرانەی خۆیندەوە

پارە روحی رەوانە  هیوای پیر و جەوانە

پولا و ئاسن نەرم ئەکا  دڵی مردو گەرم ئەکا

دور نزیک ئەخاتەوە  پیر جەوان ئەکاتەوە

هەرچەندە چڵکی دەسە  باشتر لە قەوم و کەسە

پوڵ قازیول حاجاتە  شێخە ئەهلی نەجاتە

سفرەی پڕ ئاشتی ماڵە  سفرەی خاڵی جەنجاڵە
دەوڵەمەند با نەفام بێ  با نەزان و عەوام بێ
لە لای خەڵکی زۆر خاسە  درۆی بە نرخی راسە
بێ پارە باری لارە  چاکەیشی نالە بارە
قسەی چەوت و بەتاڵە  هەنگوینی دەستی تاڵە
پارە فیدای ژەنگت بم  فیدای دەنگ و رەنگت بم
بێ تو سەفەر ناکرێ  ماشین هەڵم ناگرێ
بێ تۆ خەڵکی ناماسێ  پێم نادەن نان و ماسێ
بێ تۆ چایی چی ریپاڵ  پێم نادا یەک چایی تاڵ
حەتتا مەرگیش بێ پارە  زۆر تاڵە ژاری مارە
پارە حاجی فیدات بێ  سەری سەرگەردی رات بێ
بێ تۆ دڵم ناسرەوێ  خەو لە چاوم ناکەوێ
بێ تۆ ژن و منداڵم  ئەبنە ئاژاوەی ماڵم
خێزانم دڵی ئێشێ  بەلامەو دانا نیشێ

بـــرام بــەو تــاقە خـــوایـە کــــە بـــێ وێـــنە و تـەنیایە
هـــــەتا دونــــیا دونـیایە بــــــازاری پــــارە وایـــــە
کــــە وایــــە کـوردی دامـاو هـــەزارەکـــەی لـێ قـەوماو
زانست و هــونەر فــێر بـە ئــازا بــە شێر بـە تێر بـە
لە ســـایەی کــار و هـونەر بــــبە نــــمونەی بــەشەر
ئـــــاسن و بـــەرد و دارت بکــــە خـــزمەت گــوزارت
بــا گـەلەکـەت رزگـار بـێ بە سیە تا کـەی هـەژار بـێ
حـــاڵی لای وایـــە کــاکـە داهاتوی گـەل زۆر چـاکـە
ئــیتر خـــوداتــان لەگـــەڵ دور بـن لە پیاوی دەغـەڵ

❊ ❊ ❊

# شیربایی

شـــیربایی مـــەخۆن شـــیربایی عـــارە

جـــەزای شـــیربایی دوو پشک و مـــارە

هـــەرکەس لە دونـــیا شـــیربایی بـــخوا

شـــەرمسار ئـــەبێ لە قـــاپی خـــوا

رو ڕەش و ریســـوای هـــەردوو دونـــیایە

خـــەجاڵەت بـــارە هـــەتا هـــەتایە

مـــامۆستا، ســـەیید، کـــەدخودا دەروێش

سۆفی، مام حاجی، جوتیار، زەحمەتکێش

شـــــیربایی مـــــەخۆن گـــــونابارییە

مـــایەی روورەشـــی و شـــەرمسارییە

ئـــینسان فـــرۆشتن عـــەیبە حـــەرامـــە

کـــاری نـــەزان و خـــول و نـــەفامە

ئەم کارە کاری پیاوی بێدینە
خراپە، عارە، زۆر ناشیرینە
بۆ تام و مەزەی ئەم دەنگ و باسە
باسی نەرمین و کامینە خاسە
نەرمین کچێکی زۆر ئابڕو مەندبو
پڕ شەرم و حەیا پاک و پەسەند بو
کامینەی باوکی زۆر ناحاڵی بو
بێ دین و نەفام مەغزی خاڵی بو
بڕیاری وابو نەرمین بفروشێ
پارەی شیربایی بە زۆر بنۆشێ
هەر حەفتە چەن جار لە دێهات و شار
چەن دەستە پیاوی ماقوڵ و ناودار
بۆ خاستگاری نەرمینی نازار
ئەچون بۆ ماڵی کامینەی لاسار

مـــینه گـــوێچکه لار ئـــەهاته وتـــار
ئـــەیوت قـــەومینەی دڵســـوز و نـــاودار
شـــیربایی نـــەرمین بـــێ زیـــاد و کـــەم
بـــــەم قـــەراریـــە خـــاترتان بـــێ جـــەم
سێ مـیلیۆن حـازر چـوار مـیلیۆن قـەرزە
لیـرەی بـەرجـەستەیش سـەد دانـە فـەرزە
دوو گـــــۆشوارە و شـــەش کـــلکەوانـــە
ســـێ دەس لیـــباسی شـــیک و شـــاهانە
ســـەد کـــیلو بـرنج دوو قـوچی شـاخدار
مـــیوە و شـــیرینی بـــە تـــۆن و خـــەروار
چـــل کیلو چـایی دوو سـەد کـیلو قـەند
بـــێنن بـــۆ خـەرجـی شـادی و زەمـاوەند
بـــەڵام وسـیەت بـێ شـەو چـەرەی پـایز
لە بـــیرتان نـــەچێ هـــەرگیزا و هـــەرگیز

خەڵاتی خۆم و ژن و منداڵم

ئەبێ زۆر باش بێ هاوار بە ماڵم

بازێکی ترم لە بیر نەماوە

بەگیانی دایکم بیرم خراوە

ئەگەر شتیتر هاتەوە فیکرم

پیزە رازی بێ خاترتان ئەگرم

پیزەی خێزانم تورە و پەلیدە

نیمەی وتاری هەل مین مەزیدە

سەرەنجام نەرمین بۆ ماوەی چەن ساڵ

هەر بەم حاڵەوە مایەوە لە ماڵ

داماوی دەستی مینە و پیزە بو

جەوانی نما عومری بە سەر چو

ئیتر هیچ لاوو جەوانی نەهات

داوای نەرمین کا لە شار یا دێهات

سەرەنجام پیاوێ فەرتوتی پوڵدار
چو بۆ لای پیزە و مینەی تاوانبار
مامەڵەیان بو بە بێ ویژدانی
نەرمین تا مردن بو بە زیندانی
بو بە هاودەمی پیرێکی لاسار
لە رزۆک و کەچەڵ گەوج و دەغەزار
بو بە هاو دەمی گەوجێکی نەفام
مرخن و پرخن چڵکن و زەلام
برام ئازیزم هاو ڕازی دەردم
شەریکی خەم و هەناسەی سەردم
سەرەنجام نەرمین بو بە قوربانی
بو بە قوربانی جەهل و نەزانی
کە وایە رۆڵەی کوردی لێ قەوماو
گەلی چەوساوەی هەژار و داماو

بـــــخۆینه فـــێربه زانـــا بـــه ژیـــر بــه

خـــاوەنی مـێشک و فـەرهەنگ و بیر بـه

تـــا وەکـــو نـــەرمین ســـەرگەردان نـەبی

ئـــەسیری بـــەند و نـــاو زیـــندان نـــەبی

قەومینه تۆ خـوا هـەی هـاته هـەی هـات

شـــــیربایی لابـــەن له شـــار و دێـــهات

بـــا رۆڵـــەکـــانتان نـــەبن ســـەرگەردان

بـــە وێـــنەی نـــەرمین نـەکـەونە زیـندان

ئـــیتر بــــه دۆعـــا مـــاڵتان ئـاوا بـــێ

یـــا خـــوا مـــینه گێژ گـول و ریسـوا بـێ

یـــا خـــوا شـیربابیش بـاوی نـــەمێنێ

بــا کــچ شــوبکا و کــوریش ژن بــێنێ

حـــاڵی کـــۆتاکــه ئــەم دەنگ و بــاسه

شـــیرابـــیی نـــاخوا هـــەرکەسێ راســـه

## ژن بە ژن

بـــرام ژن بـــە ژن کـــاری عـــەوامـــە
هـــەرکەسێ بـــیکا گـــێژ و نـــەفامە
چـــوار دڵ پـــێکەوە چـــۆن دا ئـــەمەزرێ
هەر یەک لە بـەزمێ هـەر کـام لە تـەرزێ
چوار درەخت چل لق هەر لق چل شاخە
چـلۆن یـەک ئـەگـرن لەو شـاخ و داخـە
ئـــەمیان ئـــەڵێ پـــیاز ئـەویان ئـەڵێ سیر
ســـەرەنجام شـــەڕە و بگـــیرهای بگـــیر
ئـــەگـــەر دوانـــیان نـــازداری یـــەک بـن
وەک لەیلێ و مەجنون دڵداری یـەک بـن
ئـــەوانـــی تریان ئـــەکـــەونە گـــیانیان
لیـــان تـــێک ئـــەدەن خـــۆشی ژیـــانیان
ژن بـــە ژن پـــڕیە لە گـــەندەکـــاری
شـــەل و شکســـتە دار و دیـــواری

هەزاران گەن و پەنی تێدایە
سەرەنجام شەڕ و شۆڕ و داوایە
گەورە بە بچوک جەوان بە پیردان
تەڵاق بە تەڵاق خودکوشی و زیندان
زۆربەی ئاکامی ژن بە ژن دانە
بۆچی وا ئەکەن ئەو نامەردانە
ژن بە ژن کانی شەڕ و داوایە
بەدبەختی ئەسڵی بوک و زاوایە
لەوان بەدبەخت‌تر تفڵی ساوایە
لە دایکی ئەبڕێ ژن بە ژن وایە
جارجاریش یاسای ژن بە ژن کردن
جاش و مەجوشە و کەرامەت بردن
بۆ سەلماندنی ئەم قسە و باسە
باس و سەرهاتی عەودە گێژ خاسە

گوێی بۆ راگرە ئامۆژگاریە
سەوقاتە پەندە یادگاریە
بەڵی عەودە گێژ رۆژێ هات بۆلام
دوای مەرحەبایی و خێر خوازی و سەلام
وتی هەی هاوار خاکم بە سەر بێ
یا خوا ماڵەکەم ژێر و زەبەر بێ
خۆم و خێزانم لێمان قەوماوە
حەیا و ئابرومان هیچی نەماوە
میناى کچم دا بە مینەگوی لەق
ئەویش دای بە من خاتونە دەم چەق
ژن بە ژنمان کرد خوابمان گرێ
چۆن ئەبێ جەوان بە پیر بدرێ
دەساڵە کارمان هاڵە حەل وەلا
تاوێ ئەم مەلا تاوێ ئەو مەلا

سێ جار بە پارە دووجاریش بە جاش
پینەمان کردوە وەک پینەی کڵاش
قوربان تۆ خوا ئامان سەد ئامان
چارەمان چیە دەستم بە دامان
باش باش ئەزانم کارم ناجۆرە
بەڵام هاو ماڵ و هاو دەردم زۆرە
بۆ وێنە مامە ساڵح و خولە
قالە و مینە چەق کەریم و بلە
ئەوانیش وەک من خانە وێرانن
ژن بە ژنیان کرد زۆر سەرگەردانن
قالە خۆی خنکاند بلە ئابروی چو
مینەیش بەدبەختی دەستی مینا بو
کەریمیش باشە گیانی بە جاشە
خوا بیبرێ ئەم داش بە داشە

زۆر کەسی تریش وەک ئێمەی هەژار
ئابرویان نەما لە دێهات و شار
یا خوا نەمێنێ یاسای ژن بە ژن
ماڵی وێران بێ وەک ماڵەکەی من
ئێمجارە هەستام بە دەم بەندەوە
ئەم پارچە شێعرەم بۆیان خوێندەوە
وتم خەڵکینە هەی داد و بێداد
ئابروی خەڵکی بۆ ئەکەن بەر باد
مامۆستای مزگەوت مەلای سەر دەفتەر
سازمەکەن شەڕ و فیتنە و دردیسەر
شەرافەتی ژن کەرامەتی پیاو
ژن بە ژن ئەیبا بێ حەدد و حەساو
منداڵەکانیان سەرگەردان ئەبن
وێڵ گەردی چۆڵ و سەر هەردان ئەبن

شەری ناو ماڵ و داواو وەسوەسە
نایێڵی بچنە حوجرە و مەدرەسە
ئەبن بە لاتی سەر کوچە و مەیدان
ئاخریان قەتڵە و تریاک و زیندان
دەک خوا بیبڕێ ئەم داش بە داشە
قەبوڵی ناکا هەرکەسێ باشە
بەو خوایە قەسەم کە هاوتای نیە
ریشەی ئەم کارە بێ فەرهەنگییە
حاڵی خێر خوازی کوردی هەژارە
ئازاریان مەدەن باریان زۆر لارە
یا خوا هیچ کەسێ باری لار نەبێ
بە دەستی ناکەس گرفتار نەبێ

❊ ❊ ❊

## پیاوی دوو ژنه

کـــاکـــه بــزانـــه پـــیاوی دوو ژنـــه

بـــەدبەختی دەســـتی نـــەفسی نـەوسنه

تـــاوێ گـیرخـواردوی دەسـتی فـاتەیه

تـــاوێ زەلیـلی مـــەکـری خـــاتەیه

فــــاته بـــه شـــەق و خـــاته بـــه بـڵته

هـــەڵی ئـــەپەڕێنن هـــەروەکـــو قـوڵته

فــــاته له پـــــاشه و خـــاته له پـــێشه

ســـــیرمەی کـــڵاشه فـــەرمو بـــیکێشه

فـــاته ئـــەیکێشێ خـــاته بـــەری ئـــەدا

هـــــەمیشه ئـــەیدەن بـــه دارو بـــەردا

تـۆپی فـوتباڵه شـەق بـارانـی ئـەکـەن

قەرزارو گەدا و مـاڵ وێـرانـی ئـەکـەن

هەرچـی بـانگ ئـەکـا له فـاته و خـاته

جـــەوابـــی نـــیه پـــێی ئـــەڵێن لاتـــه

گەر جار و باریش جەوابیان داوە

جوین و لەعنەت و قسەی خراوە

نان و پەتیشیان فرە ڕیپاڵە

جارێ ئەسوتێ و جارێکیش کاڵە

بۆ نان و دۆیی یا نان و ماسێ

ئەونە بانگ ئەکا سەری ئەماسێ

کوڕ و کەنیشکی ئاغای دوو بەرە

شەڕ و شۆڕیانە زۆر دەردیسەرە

ئەم ئەدا لە ئەو ئەو ئەدا لە ئەم

تەق و پۆقیانە کاتی نیوە شەو

ئەونە ئەزانی کوڕەکەی خاتە

دەس ئەنێتە بین کچەکەی فاتە

لە تۆڵەی ئەودا شێرەی فاتیلە

دەس ئەنێتە ناق مینای خاتیلە

جارجاریش فـاتە و خـاتە دوو بـە دوو
یەکتر ئەکـێشن ئـەم سـو بـۆ ئـەو سـو
شــەڕ و لێــدانــەو قســەی نـاموسی
ناونیتکەی روسی و جۆینی مـەجوسی
ئــاغای دوو ژنــەیش لە تـرسی گـیانا
خــــۆی مــەڵاز ئــەدا لە دیــواخــانا
لە تــرسی شــەقی فــاتیلە و خــاتون
خــۆی دا ئـەشارێ نـامەردی چـەتون
ئــیمجار گـۆی بگـرە بـا بـاش بـزانـی
چــــۆنە ژیــــانی مــاڵ و خــێزانــی
خــاوو خــێزانــی بــێ بـەند و بـارن
لات وچـــەقۆکەش رودارو هــــارن
خوێری و دەرس نەخۆین وێڵی خیابان
لاتــــی لاکــــۆڵان شــەو لە بــیابان

ڕۆژێ پاسگا و شەڕ و شکایەت
ڕۆژێ دادگا و جورم و جینایەت
موعتادی مەی و گەرد و تریاکن
لە بابیان ئەچن پیس و ناپاکن
برام ئازیزم باش بزانە
بەردی بنچینەی کۆمەڵ خێزانە
هۆشتان بێ خاوو خێزانی دوو بەر
ئەبێتە مایەی سەختی و دردیسەر
یا خوا هیچ کەسێ ماڵ شێواو نەبێ
وەک خولە نەوسن لێ قەوماو نەبێ
«حاڵی» کۆتاکە ئەم قال و قیلە
پیاوی دوو ژنە دیل و زەلیلە
هەر ئەوەی بەسە کە خاتە و فاتە
ئەدەن بە سەریا هێلکە و تەماتە

❊ ❊ ❊

## تریاک و کەڵەشێر

بــــرای ئــازیزم روح و گــیانەکــەم
گۆی بگرە بۆ پـەند حـەکـیمانەکـەم
گەرد و تـریاک و حـەشیشی بـەدکار
دوژمنی خـەڵکن هـاوار سـەد هـاوار
ئــــیعتیاد حـــیلە و فـــێڵ و پـــیلانە
پــــیلانی دوژمـــن فـــێڵی شـــەیتانە
لە کـــــــوردستانا ئـــیعتیاد نـــەبو
بـــێگانە هـــێنای بـــێگانەی بـــەد خـو
یا خوا هیچ کەسێ قەت موعتاد نـەبێ
دیــن و دونــیامان بــا بـەرباد نـەبێ
ڕۆڵەی کــوردستان لێ هــاتوی ئـازاد
تــفکە لە تــریاک لەعـنەت لە مـەواد
لەعنەت لەو کەسەیش مـەواد ئـەهێنێ
نــاموس و ئـابڕو لە خـەڵک ئـەسێنێ

تف لە تریاک و گەردی نابەکار
دوژمنی خەڵکی بێچارەی هەژار
ڕۆڵەی قارەمان ئازادەی دڵپاک
بافور بشکێنە هەڵدە لە تریاک
لە جێی بافور و ئەوزەهری مارە
قەڵەم و کاغز بکە بە یارە
کوردە را پەڕە وەک بەبری کوێستان
پاکی کەرەوە خاکی کوردستان
پاکی کەرەوە کوردستانی پاک
لە گەرد و حەشیش بافور و تریاک
بە نوری ئەقڵ و فەرهەنگ و زانین
کوردستان بکە بەهەشتی بەرین
بنەوە لە چەک بۆ ئەو کەسانە
مەواد ئەهێنن بۆ نیشتمانە
با بڵێن ڕۆڵەی سەڵاحەدینی
خاوەنی ئاوو خاک و زەمینی

بـــۆ چـــەسپاندنی قســـە و وتـــارم
گـــۆیم بـــۆ راگـــرە بـــرای نـــازارم
ئێمە جەوان بوین بە هێز و تین بـوین
دایم خەریکی دەرس و زانـین بـوین
ئـــێوارە هـــەتا کـــاتی نـــیوەشەو
خەریکی دەرس بوین لامان نەبو خەو
نـــیمەشەو بـــەولا ســـەرمان ئـــەناوە
بـــە هـــیوای خـــەوتن پـاڵمان ئـەداوە
بە تەمای خـەوو ئـیستراحـەت بـوین
تەمایەر خەوی خۆش و راحەت بوین
کـــەڵەشێری بـــو ئـەیقوقان وەک قـو
وەخت و نـــاوەختی بـــەلاوە نـــەبو
پـــوپەیێ ســـور و لار و شـــۆری بـو
دەنگێکی زیق و گـەورە و قـۆڕی بـو
دایـــم ئـــەیقوقان شـــەو تـــا بـــەیانی
وەخت و نـاوەختی قـەت نـەدەزانـی

خەوی شیرینی لێمان تێک‌دا بو
فورسەتی خوێندن بۆمان نەمابو
ناچار کەوتینە قسەو وتو وێژ
لێکۆڵینەوە و تەدبیر و راوێژ
وتمان با بازێ تریاک و دانە
تێکەڵاو بکەین بە حەکیمانە
سەرەنجام کەمی تریاکمان هێنا
لەگەڵ دانە دا باش لە یەکمان دا
دامانە دەرخوارد ئەو بەستەزمانە
موعتاد بو کەوتە قرخەی دوولانە
لەوەو بەر ئەیوت قوقەلە قوقان
لە نیوە شەودا خەڵکی ئەتۆقان
بەڵام لە پاشان دایم ئەیمیشان
جار و بار ئەیوت شیشە لە شیشان
دوای ماوەیێ شیشەیشی نەما
هەنگاوی ئەنا و ئەکەوت بە دەما

چــەن مـانگێ ماوە ئـا بـەم حـاڵەوە

بــێ دەنگ و دامــاو کــەوتە پـاڵەوە

سـەرەنجام قـرخـە و مـیشەی لێ بـرا

زەنگـــــی رسـوایــی لە عــاڵەم زڕا

مـــــوردارەوە بــو بــە شـــەرمساری

بـوبە ریشــخەندی دێـهاتی و شـاری

بــرام ئـازیزم بـاش بـاش بـزانــە

بــەو تـاقە خـوایـە کـە بێ مـەکـانە

ئــەگـەرچی مـوعتاد زۆر تـاوانـبارە

بێ هـەست و بـیرە، خـام و بـەدکارە

بــەڵام کــومەڵ و جــامیعەی بـەدکار

تــاوانــبارترن هــاوار ســەد هـاوار

ئەگـەر جـامیعە دوروس و راس بێ

نــەهادەکــانی دڵسۆز و خـاس بێ

لە جـــێی مــوعتاد و دزو نــاپەسەند

پـــەروەردە ئـەکـا زانـا و هـونەرمەند

کەوایە ئەبێ هەمو راپەڕین

کۆمەڵ دروس کەین دوژمن هەڵدڕین

ئیتر موعتاد و غەیرۆ نامێنێ

هەمو کەس ماف و حەقی ئەستێنێ

یا خوا هیچ کەسێ قەت موعتاد نەبێ

با دین و ژینی کەس بەر باد نەبێ

«حاڵی» کۆتاکە ئەم بەند و باوە

عالەم ئەزانێ موعتاد خراوە

## ئارەق و سیگار

بــرای شــیرینم روح و گــیانەکـەم

گۆی بگرە بۆ پـەند حـەکـیمانەکـەم

ئارەق و سیگار بـێ سـود و کـەڵکن

بە گـیانت قـەسەم دوژمـنی خـەڵکن

من باش ئەزانم تـۆیش بـاش بـزانـە

زەرەریـــان هـــەیە بـۆ مـاڵ و گـیانە

حـــەیفە ئـــارەق و قـلیان و سـیگار

ببن بـە هـاو دەم پـیاوی خـەباتکار

حـــەیفە ئـارەق و سـیگاری بـەدخو

بـــبێ بـــە هـاودەم پـیاوی لێ هـاتو

بـــرای شـــیرینم، ئـــارامـــی گـــیانم

ژیـــری لێ هـــاتو روحـــی رەوانـــم

بـــــازوبەندەکـــەی بـــرینی بـــازوم

تـــــەنیا ئـــومیدی رۆژی داهـــاتوم

بشکێنە قلیان هەڵدە لە سیگار
لابە ئارەقی پیسی نالە بار
لە جێی ئارەق و ژەنگی سیگارت
کتێب و دەفتەر بکە بە یارت
ئارەق و سیگار عالەم ئەزانێ
خێری تیا نیە بۆ هیچ ئینسانێ
سەراپا دەرد و رەنج و زەرەرە
بۆ هەمو کەسێ هەر دەردیسەرە
زیانیماڵی و زەرەری گیانی
هەموی تێدایە خۆیشت ئەزانی
ئینسانی ئاقڵ گەر راستت ئەوێ
هەرچی زەرەر بێ توخنی ناکەوێ
کە وایە کاکە مەرد بە مەردانە
لا بە سیگار و ژەنگی قلیانە

هەڵدە لە ئارەق سەرباری ژینە
زەرەری هەیە بۆ دونیا و دینە
زیانی هەیە بۆ ماڵ و گیانە
تێک ئەدا عەقڵ و روح و رەوانە
وەسوەسەی شەیتان نەتخلەتێنێ
وازی لێ بێنی وازت لێ دێنێ
تی هەڵدە لابە ئەم گەن و پەنە
خۆت مەکە بە پەن وەک خو لەگەنە
بۆچە سپاندنی پەند و راوێژم
با باسی خو لەو بلەت بۆ بێژم
خولە چەندین ساڵ سیگاری ئەکێشا
تاوێ ئەقوزی، تاوێ سەری ئێشا
مژی لێ ئەدا و ئەیکێشا زو زو
ملی باریک کرد وەک تاڵی دەزو

دیانی ڕەشەو کرد سمێڵی زەردبو
دەم و سمێڵی لە خیگە ئەچو
گیرفانەکانی لە پوڵ خاڵی کرد
ماڵ و بەدەن و روحی تیا برد
سەرەنجام کەوتە قرخەی دوولانە
میشەی لێ برا ئەوگوێچکە پانە
بە فیرۆ دەرچو گیانی شیرینی
خراپ تیا چو یا خوا نەیبینی
نیکوتین کوشتی بو بە قوربانی
بە ناحەق دەرچو روحی رەوانی
بلەیش شەوو رۆژ ئارەقی ئەنۆشا
بۆ خەرجی ویسکی زۆر تێ ئەکۆشا
وەکو سەوەتە زکی رەواوە
نەیدەتوانی باش هەستێتە پاوە

چوار گوش وەستا زکی لێ زل بو
ئیمانم نەچێ لە خیگە ئەچو
ڕۆژێ لە ڕۆژان زۆری خواردەوە
مەس بو لە مالاْ خۆی داشاردەوە
ئەحوالی تێکچو لە پاش و پێشا
سەرەنجام وەکو شوتی تلْیشا
بێچارەی داماو لە بەر نەزانی
بە شەرمساری بو بە قوربانی
برای شیرینم دۆس و یارەکەم
گۆی بگرە بۆ پەند گەوهەر بارەکەم
وەک خو لەو بلە خۆت مەکە بە پەن
مەبە بە ڕەفیق هەرزە و ناپەسەن
گۆی بدە بە پەند پیری دلْسۆزت
مەبە بە سەربار بۆ گەل و هۆزت

بێ با پێکەوە دەستە و دۆعا بین
لە قاپی خوای ئاسمان و زەمین
بڵێین ئەی خودا لاوانی هەژار
نەکەونە داوی ئارەق و سیگار
پیریش ئارەق و سیگاری بێ فەڕ
نەیکاتە پیری عاقیبەت بە شەڕ
با لە دەورانی پیری و فەرتوتی
بۆی سیگار نەیێ لە دەم و لوتی
قیزی لێ نەکەن ژن و خێزانی
با وەکو گوڵ بێ دوو لێوی جوانی
ئیتر بە دۆعا هیوام وەهایە
سرکەون باش بن هەتا هەتایە
«حاڵی» گەوهەرە دەسە دیاریەکەی
قەبوڵی فەرمون ئامۆژگاریەکەی

* * *

## بێوەی منالّدار

بــێوەی مــنالّدار مــەخوازە کــاکــە
قسـەم قـەبوڵکـە بۆ خـۆت وا چـاکـە
ســـەرەنجام خـــۆی و مـنالەکــانی
ئــەبنە دوژمــنت بــا بــاش بــزانــی
خــاس بــی یــا خـراو بـۆ تـو خـراون
هــەرگیزا و هـەرگیز بـۆت حـاڵی نـاون
بــێوە ژن ئــەگــەر دارای مــناڵ بــێ
با زور جـەوان و خـاوەن کـە مـاڵ بـێ
هــەر کــەس بیخوازێ خـەیالّی خـامە
یـــا زۆر نـــەوسنە یـــا زۆر نـــەفامە
ژنـیش نــابێ تــەک پـیاوی مــنالّدار
ببێ بــە هـاوسەر هـاوار سـەد هـاوار

خـــاوو خـــێزانـــی غـــەیرۆو دوو بـەرە

بـــۆ هـــەموکەسێ هـــەر دەردیســـەرە

بـــۆ رون بـــونەوەی ئـــەم کـــارساتە

گـــۆی بگـــرن بـــۆ باس کـەریم وفـاتە

فـــاتە بـــێوە ژن فـــرە جـــەوان بـــو

وەک مانگی چواردە و سەروی رەوان بو

کـــوڕ و کـــچێکی هـــارو هـــاجی بـــو

ژیـــان لەگـــەڵیان نـــاعیلاجی بـــو

کـــەریم عـــاشقی بـــاڵای فـــاتە بـــو

ئەقڵ و شـو عـور و بـیری لە دەس چـو

ئـــەویش دوو کـوڕی زۆر چـەتونی بـو

مـــەردم ئـــازار و شـــەرور و بـــەدخو

چـــارە نـــوس وابـــو کـــەریمە نـــازێ

فـــاتە بـــێوەژن ئـــەبێ بـــخوازێ

داوای فـــاتەی کــرد فــاتەی پــێدرا

دوای چـــەن رۆژێ[٢] زەمـــاوەن کــرا

چـــەن ســاڵ پـێکەوە ژیـان بـە خـۆشی

لیـــباسی کــەیف و شــادییان پــۆشی

لە پــاش مــاوەیێک مــندالْــە کــانیان

بـەربونە گـیان یـەک ئـامان سـەد ئـامان

بــوبە شـەڕ و شـۆڕ هـەراو لە یـەکـدان

یــەکـیان ئـەکـێشا مـەیدان بـە مـەیدان

ئــەو ئــەیدا لە ئــەم ئـەم ئـەیدا لە ئـەو

شــــەڕ و لیــدان بــو هــەتا نــیوەشەو

ســەرەنجام فــاتە و کــەریمیش ئـەمجار

پــــایان کـــێشایە جــەنگ و کـــارزار

ئـــیمجار شـــەڕبوە خــاوو خـــێزانــی

شــەڕ و هــەرا بــو شــەو تــا بــەیانی

جــاران بــه بــێ یــه‌ک گــیانیان نــه‌بو

پــاشان بــه بــێ شــه‌ڕ ژیــانیان نــه‌بو

دوو ســالێ ره‌بــه‌ق شــه‌ڕ و هــه‌رابـو

کــاریان له پــاسگا و له دادگــا بــو

ســـــه‌ره‌نجام لُه یــه‌ک جــیا بــونه‌وه

بــــه‌ره‌و کــــۆسپێکی تــازه چــونه‌وه

خۆیان لێ قـه‌وما و منالْ قـوڕ بـه سـه‌ر

کـه‌وتنه گـێژاوی سـه‌ختی و ده‌ردیسـه‌ر

جاران چواربـون ئـێستا بـون بـه شـه‌ش

له ســایه‌ی فــاته و کـه‌ریمه بـێ بـه‌ش

کــه‌وتنه گــێژاوی خــه‌م و وه‌ســوه‌سه

بــون بــه دوژمــنی ده‌رس و مــه‌دره‌سه

بون به چه‌قو کێش کوچه و سه‌ر شـه‌قام

دزو ده‌س بــــڕو پــیاو کــوژ و نــه‌فام

سەرەنجام چواریان تیرباران کرا
گیان و ئابرویان بە تالآن برا
ئەو دوانەکەیشیان لە بەندیخانەن
جێگای ریشخەندی خزم و بێگانەن
برای ئازیزم دۆس و یارەکەم
گۆی بگرە لە پەند گەوهەربارەکەم
بێ باراپەرین زۆر ئازادانە
کۆمەڵ دروس کەین مەرد و مەردانە
تەنگ و چەڵەمەی ئابوری و قانون
لابەین لەو لآت بە بێ چەند و چون
ئەمجار منداڵدار بە بێ ترس و خەم
زەماوەند ئەکەن خاترت بێ جەم
بەلآم تا کاتێ کۆمەڵ بیمارە
باری ئابوری و فەرهەنگی لارە

خـــاوو خـــێزانت مـــەکـــە دووبـــەرە

خـــۆت بـــپارێزە لەم دەردیســـــەرە

تـــا تـــۆیش هـــەروەکـو کـەریم و فـاتە

نـــەبی بـــەریشخەند خـــەڵکی ولاتـــە

«حـــاڵی» کـــۆتاکـــە شـــێعر و وتـــارە

بـــەو خـــوایـــە کـــەوا پـــەروەردگارە

چـــارەنوس چـــۆنە ئـــەبێ هـــەروابـــێ

کـــەس لە چـــارە نـوس نـەجاتی نـابێ

## پیاوی تەڵاق خۆر

پیاوی تەڵاق خۆر گێژو نەزانە

یا زۆر نەفامە یا بێ ئیمانە

پیاوی ناحاڵی و خول و ئابڕو چو

تەڵاق تور ئەدا یەک یەک و دوو دوو

بە شوێنی یەک دا تەڵاق بارانە

بۆ چی وا ئەکەن ئەو نامەردانە

ژنیان بازیچەی سەر زمانیانە

بنێشتە تاڵەی ژێر دیانیانە

قەسەم بە تەڵاق کەی کاری پیاوە

قەسەم خۆر عەقڵی زۆر ناتەواوە

تەڵاق ناموسە شۆخی پێ ناکرێ

ئابڕوی خۆت مەبە خودا هەڵ ناگرێ

ئافرەت گەوهەرە جێی قەدر و ڕێزە
دایکی وڵاتە باش بیپارێزە
بەردی بنچینەی نیشتمانتە
کۆڵەکەی ماڵ و دیواخانتە
حەیفە بیکەیتە بازیچەی دەستە
تەڵاق خۆر گێجە بێ هەستە پەستە
پیاوی عاقڵ و زانا و با شەرەف
ئافرەت ناکاتە جێگای گاڵتە و گەڤ
بەڕاستی هەرکەس کە تەڵاق خۆرە
لە هوز و بەرەی خو لە دەم بۆرە
بۆ چەسپاندنی ئەم کارساتە
گوێ بگرن بۆ باس قالە تەماتە
قالە لە هۆزی خو لە دەم بۆربو
هەرزە و دەم بە تاڵ زۆر تەڵاق خۆر بو

لە وەرزی پـــاییز شـەویٚ هــات بـۆلام

پاش ئەحواڵ پرسی و سوپاس و سەلام

وتـــی ئـــوستادم ئـــامان ســـەد ئـــامان

پـــــەنام هــــێناوە دەســـتم بـــەدامـــان

قـــوربان تـــا ئـێستا زیـــاتر لە ســەد جـــار

تـــەلاقم کـــەوتوە هـــاوار سـەد هـــاوار

چـــەن جـــاری تـریش لاڵ بـێ زمـــانم

مـــارە بـــە جـــاشم کـــردوە خـــێزانـــم

جـــارێک لە فـــەتە دوو جـــار لە بـــلە

ســـێ جـــاری تـــریش لە مـــامە خـــولە

کـــــــــەسێکی‌ترم لە بـــــیر نـــــەماوە

چـــــونکو حـــــافیزە و بـــیرم خـــراوە

کـــــــویرایـــیم دابـــێ دوێـــنێ ئـــێوارە

ســــــیانی‌تریشم تـــــوردا دووبــــــارە

هــاوار بــه مـاڵم بـەرە و کـۆی بـرۆم

دیسـان پـینەی کـەم وەک کـڵاشی دۆم

ئــاخ و داخ و دەرد خــۆزگا ئــەمردم

کـولکە مـەلا و جـاش ئـابڕویان بـردم

هەرچـی پـارەم بـو بـردیان بـە جـارێ

ئــابروشیان بـردم بـە ردیـان لێ بـارێ

ماڵ و ناموسیان تالاّن کـرد سـەر جـەم

شـــەرتە هـەزاریـان لێ قـەلا چـۆکـەم

بــــرام ئــــازیزم ئـــەم جـۆرە کـــارە

خـــــیلافی عـــــەقڵە زۆر نــــالەبارە

بــــاییسی داخ و دەرد و حــــەسرەتە

جــێگای ریشـخەند و تـف و لەعـنەتە

مامۆسای مزگەوت مەلای سەر دەفـتەر

تۆ خوا وامەکەن دەک خاکمان بـەسەر

بـــو نگـــای تـــەڵاقتان بـۆ چـی دانـاوە
مـــامەڵەی تـــەڵاق کـــێ فـــتوای داوە
تەڵاق سێ هەزار جـاش بـەسی هـەزار
کـــەی ئـەمە کـارە هـاوار سـەد هـاوار
ئـــاخرکەی تـــەڵاق بـــە پـــوڵ و پـارە
خــۆش ئـــەبێتەوە کـــەی ئـــەمەکـــارە
مـــەلا قـــەسەم بـــێ بـــە قـــەبری زاڵـە
خــۆیشت ئـــەزانـــی کـــارت بـــە تـــاڵە
بـــــەگـــــیانی قـــــالەکـــە پــــەتیارەیە
ئـــــەم کــــــار و بـــــارە لە بـــەرپارەیە
خــۆیشت ئـــەزانـــی کـــارت بـــە تـــاڵە
شـــەیتان بـــەم کـــارت تـــەواو خــۆشحاڵە
ئابڕوی ژن مـەبەن بـە مـارە بـە جـاش
ژن ئـــابڕومەندە بـــاش تـــیفکرن بـاش

لە لایـــەن دیـــن و شـــەرعی خـــواوە

لە جاش و مەجوش لەعـنەت کـراوە

لەعنەت لەو کەسەیش بـە بۆنەی پـارە

ئـــەبێ بـــە دەڵاڵ ئـــەم کـــاروبارە

حـــاڵی بـــەسیەتی شـــەرع بـــنی قـوڵە

ئـــاغا عـــاشقی دیـــنار و پـــوڵە

بـــەڵی لەم دونـــیا وەر ئـــەگرێ پـارە

بـــەلاّم لەو دونـــیا زۆر شـــەرمسارە

ئـــیتر بـــە دۆعـــا خـــوداتـــان لەگـــەڵ

یـــا خـــوا دور بـــن لە پـیاوی دەغـەڵ

## شەم و پەروانە

ئازیز تۆ خوات پەنام هێنا بۆت

رەحمت بێ بە حاڵ غوڵامەکەی خۆت

دۆیشەو لە خەوما کەوتمە پەژارەت

دوربا رەنجابوی لەم خزمەتکارەت

دوربا لێم زیز بوی هاوار بە ماڵم

تا سەحەر شیوا حاڵ و ئەحواڵم

تا سەحەر نەما هێز و قەرارم

کولاوە زەخمی قەلبی بیمارم

کوێرایی‌م دابێ بۆ خۆم و خەوم

بۆ شانسی رۆژ و بۆ بەختی شەوم

کوا بو حاڵ زانێ هاودەردێ وەک خۆم

بە پێچەوانە تەعبیری کا بۆم

کوا شێخی بە سری کوا ئیبن سیرین

کوانێ شێخ حەسەن پیری دونیا و دین

تـا تـەعبیری کـەن خـەوی نـاجۆرم
بـەڵکو ساریش بێ زەخمی نـاسۆرم
بـاش وایـە پـەنابیەم بـۆ یـارم
بـەڵکو رەحـمی بێ بە حـاڵی زارم
خـۆی تـەعبیری کـا خـەوی نـاسازم
بـا خـۆی بـزانـێ راز و نـیازم
یـا خـوا تـەعبیری گـیان کـێشانم بێ
نـیشانەی حـاڵی پـەرێشانم بێ
مـاڵ و سـامانم نـەزری خـوا بێ
بـەڵکو تـەعبیری ئـازیزیش وا بێ
ئـاخر کـەی رەسـمەکـەی بـاوە ئـازیز
شـالەگـەدایێ دڵـی بـبێ زیـز
«حـاڵی» پـەروانـەی شـەرارەی شـەمە
بـێشی سـوتێنی هـێشتا هـەر کـەمە

* * *

# پەیامی عاشقانە

دوێی شـــەو دوبـــارە دیكـــی دەرونـــم

هـــاتە كـــوڵ لە نـــاو لاشـــەی زەبـــونم

دیـــم قـــاورمەی دڵ ئـــەبرژا تـــاو تـــاو

لە ئـــاشپەزخـــانەی دەرونـــی ســـوتاو

جـــەرگیشم لە پـــاڵ قـــاورمەكـــەی دڵ

جـــۆشا و خـــورۆشا هـــاتە كـــەف و كـــوڵ

هـــابو بـــە قـــەقنەس چـــزڵیكی جـــەسەم

ســـوتام و بـــرژام بـــە گـــیانت قـــەسەم

هـــاوار ســـەد هـــاوار هـــابوم بـــە كـــەباب

ئەعزام لەت لەت بو وەك كوٚتەی قەساب

كـــاتێكت زانـــی بـــڵێسەی دەرون

ســـوتاندی ســـاراو كـــەژ و كـــۆو هـــامون

ئـــاتەش فشـــانی قـــەلبم هـــاتە ســـەر
کـــاتێکت زانـــی دونـــیای گـــرتە بـــەر
ئـــاتەشکەدەی دڵ هـــەڵگرسا بـــە تـــین
ســـوتاندی دەشت و ســـارا و ســـەرزەمین
دوکـــەڵی ئـــاە و هـــەناسەم یـــەکـــجار
دونـــیای داپـــۆشی وەکـــو هـــەوری تـــار
ئـــەو هـــەورە رەشـــەی گـــەواڵ گـــەواڵە
کـــەیەکـیان گـــرتوە لەو کـــێو و یـــاڵە
بـــۆقی دەرونـــــی پـــڕ لە ئـــێشمە
هـــاڵاوی جـــەسەی گـــەرم و رێشـــمە
ئـــەو تـــەم و مـــژە لەو دەشت و دەرە
کـــە دونـــیای داگـــیر کـــردوە یـــەکســـەرە
دوکـــەڵی ئـــاە و هـــەناسەی مـــنە
لە هـــەوشارەوە تـــا شـــاری ســـنە

کـــوا بــۆ دڵســۆزێ پــەیام ڕەســانێ
ئـــەحواڵـــی دەردی ئـــێمە بـــزانـــێ
خـــەبەربا بـــۆ لای شـــای وەفـــاداران
حـــەکـــیمی دەرد و زامـــی بـــیماران
بـــەڵکو ڕەحـــمی بـــێ تـــەشریف بـهێنێ
یـــا شـــیفابدا یـــا گـــیان بســـێنێ
شـــیفا یـــا مـــردن بـــۆ مـــن یـــەکســـانە
چـــون هـــەدەف دیـــدار جـــانی جـــانانە
«حـــاڵی» پـــێی خـــۆشە یـــاری دڵـپاکـی
لە پاش خۆی بێتە سەر گڵ کـۆی خـاکـی

* * *

## گێژاوی مەینەت

ئـــازیز بـــڕوانـــە لاشـــەی زەبـــونم
ســـەر بکـــێشە نـــاو کـــولبەی دەرونـــم
ســـەر بکـــێشە نـــاو ئـــەم خـــەراباتە
تـــا بـــاش حـــاڵی بـی لەم کـارە ساتە
دڵـــــم وەکـــو گـــوڵ لە دار کـــەنیاوە
هـا بـە ســەر گـێج و مـەوجی دەریـاوە
گـێژاوی مـەینەت لێـی ئـەدا تـاو تـاو
تـاوێ ئـەم گـێجاو تـاوێ ئـەو گـێجاو
شـــەپۆلی خـــەفەت دیسـان دایـە بـەر
لە دەریای مەینەت غەرقی کرد یەکسەر
کـــاتێکت زانـــی نـــەهەنگی مـــاتەم
قـــوتی‌دا لە نـــاو دەریـاچەکـەی خـەم
هـــانا ســـەد هـــانا کـــوا مـــەلەوانـــێ
کـــەشتی نـەجاتێ حـاڵ زانـێ کـوانـێ

بـــێ بـــۆ نـــەجاتی قـــەلبی ئـــاوارەم
لە گـــێجی دەریـــای مـەوجی پـەژارەم
بـــە خـوا مـەر ئـازیز بـێ بـۆ نـەجاتی
بـــــە دەســـتی ئـــەوە هـــات نـــەهاتی
ئـــەگـــینا ئـــەگـــەر تـــەواوی عـــاڵەم
بـۆ نـەجاتی ئـەو یـەکسـەر ببن جـەم
نـــەجاتی نـــابێ بـــە خـــودا قـــەسەم
یار خـــەبەردارکـەن هـاوار بـە جـەسەم
«حـــــاڵی» دیـــــارە خـــەیاڵت خـــامە
هـــەسارەی بـــەختت لێـــل و نـاکامە
نـــــەجاتت نـــــابێ چـــارەت ســـیایە
ئـــــەبێ هـــــەروابـــی هـــەتا هـــەتایە

* * *

## باڵاخانەی دڵ

باڵە خانەی دڵ مەنزڵگای یارە
کۆیرایی‌یم دابێ یار نا دیارە
کوا بۆ دڵسوزێ خەبەر بێنێ بۆم
تا پێشکەشی کەم روح و گیانی خۆم
خەیاڵم خامە کەی ئەمە کارە
کەی گیان لایەقی پێشکەشی یارە
ئازیز بە گیانی ئازیزت قەسەم
ئاگری دوریت بەر بوەتە جەسەم
سوتاندی قەلبی زار و زەبونم
هاتە کەف و کوڵ دیکی دەرونم
ئازیز بە گیانت پەشێوە حاڵم
سوتام و برژام هاوار بە ماڵم
کاتێکت زانی هەر بەم حاڵەوە
بوم بە گەردەلول دەم شەماڵەوە
سەحەرگای جومعە بە سۆز و زاری
ئەپاڕێمەوە لە درگای باری

ئـەڵێم یـاخوا لەیـل نـەبینێ زەرەر
بـە خـێر بـێتەوە لە سـەیر و سـەفەر
گەردی ڕێگاکەی سـورمەی چـاومە
دەرمـــانی جـــەسەی داوەشـــاومە
خـاکـی بـەرپاکـەی شـیفای ئـێشمە
دەرمـــانی زامــی دڵــەی ڕێشـــمە
ئازیز بـەڵێن بـێ لە بـەر درگـاکـەت
بە چاو جاروکەم گەردی بەر پاکەت
ئـــیزنیشم نـەدەی هـەر خـزمەتکارم
خـــزمەتکارەکــەی پـــار و پـــێرارم
«حاڵی» کۆتاکـە ئـەم دەنگ و بـاسە
کــەم هــەڵ بکـێشە ئـاه و هـەناسە
نە وەک شەرارەی هـەناسەی بـەتین
ئـــاگـر بـەر داتـە ئـاسمان و زەمـین

❊ ❊ ❊

## وفاداری

عـــەزیزم گـــیانی شـــیرینم ســـەرو مـــاڵم بـە قـوربانە
حـــەریمی بـــارگاکـــەی تـــۆ پـــەناگـــاهی غـــەریبانە

مەسیح ئـاسای هـەناسەی تـۆ نـەسیمی جـانی جـانانە
گوڵ و گوڵزاری روخسارت وەکو فیردەوسی عـەدنانە

لە بێنی تـۆیە مـوشک و عـەتر و عـەنبەر وا فـراوانـە
سەر و ماڵم فیدای غەمزە و نـیگاه و رەمـزی چـاوانـە

شـــەرابـــی زەمـــزەمی لێـوت شفای ئـازار و دەردانـە
وەکـــو ئـــاوی حـــەیاتە بـــۆ ئـــەویندار و مـــوریدانـە

نـەسیمی سـوبحدەم روی کـردە نـاو گـیسو و گـریبانە
وەکـــو حـاجی تـەوافـی کـرد جـەماڵی مـاهی تـابانە

شـەماڵ دیسـانەوە گـیسوت ئـەکـاشانە لە سـەر شـانە
هـــەمو عـــالەم پـــەرێشانە لە پـــای زولفـی پـەرێشانە

لە حیجابی سەرت بـۆچی دوومـاری زولفـە زیـندانـە
مەعازەڵلا کـەسێ حـەزکا بـە ئـەم زیـندان و بـەندانـە

لە داوی زولفە تاتاکەت نەچیری دڵ هەراسانە
ئەسیر بون لەم تەڵە و داوە عەزیزم سوک و ئاسانە

لە تەعقیداتی زولفی تۆ بە لاغەمات و حەیرانە
تەنافور قەت نیە و نابێ لە ناو ئەم گەشت و سەیرانە

موتەووەل موختەسەر بو بۆ بەیانی وەسفی شایانە
بە ئەتوەل شەرحی بۆ بێنا مەڵی رون و نمایانە

کەمانی ئەبروانە پەرتی کرد وا تیری موژگانە
لە خاڵی دا لە سینەی بێ خەیاڵی خزم و بێگانە

بە هێزی زوڵفە قاری دوو دەمی ئەبرۆی نگەە بانە
هەزاران کەس بریندار و شەهید و قوڕچی قوربانە

شکا ئەژنۆم لە پای مێحرابی دوو چاوی درەخشانە
بە سەر چوم رو بە قیبلە بۆ تەوافی زولفی پەخشانە

بە کافوری دەمت بێشورە لاشەم رەسمی چاکانە
ئەگەرچی غوسڵی پێ ناوێ شەهیدی دەست و پەیکانە

له مەیخانەی خەراباتت هەیا هوی مەست و ریندانە
هەزاران عاشق و عابد لەوێ دا دیل و زیندانە

هەزاران شێخ و سۆفی قیبله بۆسی خاکی پێتانە
وەفادار و فیداکار و غولام و حەلقە گوێتانە

منیش و پیری دەسگیرم بە دەستوری حەکیمانە
کرایـنە بادە چی مەیخانە و مەسئولی پەیمانە

فیداکار و وەفادارین له پای ئەم عەهد و پەیمانە
بەلا گەردانی بالاکەت شەهیدە ئەهلی ئیمانە

بلێ حالی وەسییەت بێ له بو دلسۆز و یارانە
له سەر کێلی مەزاری تۆ بنوسن ئەم شوعارانە

له پێناوی ئەوینا هەر کەسێ بمرێ بە مەردانە
حیسابی ئەو له مەحشەردا لەگەڵ جەمعی شەهیدانە

مەڵێن «حالی» بە تەنیایی خەریکی شیعر و پەخشانە
هەزاران بولبولی عاشق غەزەل خان و پەرێشانە

* * *

## بەهار

یـــاران مـــوژدە بـــێ دیســـان بـــەهارە
کـــاتی چـــیمەن و گـــوڵ و گـــوڵزارە
وەخـــتی زەمـــزەمەی دەشت و نســـارە
فـــەسلی هـــەیاهوی شـــاخ و کـــۆسارە
بـــــوکی رازاوەی بـــــەهاری تـــازە
بـــە زەردە خـــەنە خـــەریکی نـــازە
ســـارا و ســـەرزەمین بـــۆ دیـــداری یـــار
خـــۆیان دەق ئـــەدەن ڕۆژێ هـــەزارجـــار
شـــــەونمی گـــۆنای لالەی لانـــزار
نـــەخشاندی وێـــنە و دیـــمەنی بـــەهار
گـــولاڵە ســـورەی نـــازک نـــازەنین
کـــەوتە خـــەمزە و نـــاز ســـەما و پـێکەنین
هـــەلاڵە بـــرمە و بـــەرەزاونـــە ســرین
زولف و پەرچەمیان پەخشان کرد چین چین

وەنـــەوشە و شـــەوبۆ هـــەلامە و گـــوڵنار

لە بـــاغی لەیـــلاکـــەوتنە لەنـــجە و لار

قـــومری بـــە ســـۆز و چـــەهچەهەی شیرین

خـــونچەی نـــەو ڕەســـی خســـتە پـــێکەنین

چـــنور پـــەرچـــەمی کـــردوە پـــەرێشان

یـــاسەمەن زولفـــی خســـتوەتە ســـەرشان

گوڵی زەرد و ســور دەس لە مـل یـەک بـون

هـــزار مـــاشەڵلا لە کـــاری گـــەردون

شـــورەبی و چـــنار شـــەمشاد و لەولاو

هـــەڵپەرکێیانە لە گـــۆی چـــۆم و ئـاو

زولف و کـــاکـــۆڵیان لە یـــەک ئـالاوە

تـــاڵێکیان کـــرژە و تـــاڵێکیان خـــاوە

مـــەسیحا ئـــاسای هـــەناسەی ســـەحەر

زیـــندوی کـــردەوە مـــردو وەک مـــەحشەر

ســـازی شـــەماڵ و مـــوسیقای زریـــان

هـــەوری بـــەهاری کـــردوەتە گـــریان

سازی شەماڵ و موسیقای زریان
هەوری بەهاری کردوەتە گریان
سەمتوری جۆگە و عودی شەتاوان
بولبولی شێت کرد لە روخی ئاوان
سروەی نەسیم و لەرەی گەڵای دار
لارەی شۆڕە بی و هەڵپەڕکێی چنار
جیهانی کردە بەهەشتی بەرین
فیردەوس ئاسا بو سارا و سەر زەمین
هاژەی قەڵبەزە و خرینگەی باران
بەتاڵانیان دا عەقڵی دڵداران
دو بارە گوڵ و بولبول وەک جاران
بە یەک گەییشتن لە ناو گوڵزاران
ئەفسونی گوڵ و سیحری گوڵاڵە
بولبولی خستە گریان و ناڵە
ئەمجارە بولبول بە وەفاداری
راوەستا لە پای عیشق و دڵداری

بەسۆز و ناڵە و گریان و زاری
بۆ بە عەوداڵی گوڵزاری یاری
هەرگیز ناشکێنێ عەهد و پەیمانی
پێشکەش بە لەیلە روح و ئیمانی
هەزار ئافەرین لەم دڵدارییە
لەم ئەمەکداری و وەفادارییە
بەڵێ هەتاکو دونیا دونیایە
بەهار مەڵبەندی عەهد و وەفایە
«حاڵی» بەهاران زۆر پەرێشانە
غەریب و دڵتەنگ دور لە یارانە
بۆیە خەریکی راز و نیازە
عاشقی شێعر و ساز و ئاوازە

* * *

## دونیای بێ وەفا

دونیای بێ وەفا چەرخی جادوگەر
هەوارگەی خەفەت جێگای دەردیسەر
چەرخی ژەنگاوی فەرتوتی زۆر پیر
بەندیخانەکەی سەراپا تەقسیر
کاروان سەرای کۆن ماڵی دەرد و ئێش
جێگای پەژارەی شەهەنشاو دەروێش
چەرخی جادوگەر کۆنی حیلە باز
قاپی بەدبەختیت بۆکێ نەکرد واز
تاج و تەختی کێت سەرنگون نەکرد
رەنجی کێت بە رەنج بێستون نەکرد
زیندانی خەم و دەرد و بەدبەختی
ماڵی مەینەت و پەژارە و سەختی
چەرخی چەپ گەردی بێ بەقای نامەرد
کێت نەکرد رەنگ زەرد بە هەناسەی سەرد

کۆنی کۆنه ساڵ بێ سود و مایه
دیواری روخاو بێ ئەسڵ و پایه
بۆ عەهد و وەفا و پەیمانت نیه
بۆ شەرت و قەوڵ و ئیمانت نیه
هەردەم به بەزمێ سورِ ئەخوێ به تاو
هەر ساتێ نەزمێ ئەخێته بەرچاو
ساتێ سابت نیت له سەر کردارت
هەر دەم جۆرێکه شێوەی رەفتارت
هەررۆژێ کەسێ ئەکەی سەرگەردان
ئەیخەیته ریزی هەناسه سەردان
سینەمای سەییار بێ رەویه و رەوشت
بێ روکن و پایه بەد خوی بەد سرشت
بۆچی هەر رۆژێ شکڵێ ئەنۆینی
هەر تاوێ نەقشه و رەنگێ ئەرژێنی

مەیگێڕی بادەی جورعەی بەد بەختی
ساقی شەرابی پەژارە و سەختی
کۆنی کۆنە ساڵ دەس بڕی شەیباد
ڕەنجی کێت نەکرد بە ڕەنجی فەرهاد
لە کوێیە تاج و تەختی ئەمیران
شازادە و سەرخێڵ میر و وەزیران
کوانێ دەبدەبەی سەرعێڵی جاران
کۆشک و هەوارگە و مەڵبەندی یاران
لە کوێیە غەمزەی سیمین عوزاران
لە کوێیە نەغمەی یار و دڵداران
لە کوێیە عیشق و سەفای قەدیمان
ئادەی کێت نەکرد شادی پەشیمان
شەرتە تا ئەڕۆم لە کاروان سەرات
باوڕم نەبێ بە عەهد و وەفات

شــــەرتە تــــا روجـــم لەلام مــیهمانە
تــەسدیقی نــەکــەم شــەرت و پــەیمانە
شــــەرتە تــــا ئــەروا روحـــی رەوانــم
قــەوڵ و پــەیمانت بــە هــیچ بــزانــم
وەخــــتێکیش مــردم بــرای هــاوەدەردم
شــەریکی خــەم و هــەناسەی ســەردم
بـــە خـــوێن بـنوسن کـێلی مــەزارم
بــیکەن بــە مــەرهەم لاشــەی بــیمارم
بـــنوسن دونـــیا جــێگای جــەفایە
بــێ عــەهد و پــەیمان زۆر بێ وەفـایە
«حـــاڵی» بــەسیەتی کــۆتاکــە وتــار
لە دەنگ و بــاسی چــەرخی نــا هــەموار
چــون ســاکــنانی ئــەم چــەرخــە کۆنە
ئـــەزانـــن شــێوەی ڕەفــتاری چــۆنە

* * *

## ناوی مانگەکان بە زمانی کوردی

کـــوردە پـــێشینیان وایـــان دانـــاوە
ســـەرەتای بـــەهار نـــەورۆزی نـــاوە
خـــــاکـــــەلێوە یـــە یـــادگاریە
جـــەژنی پـــرشکۆی کـــوردەواریـــە
گـــولانیش دووهـــەم مـــانگی بـــەهارە
کـــاتی چـــیمەن و گـــوڵ و گـــوڵزارە
گولان بـە خـەمزە و نـاز و لەنـجە و لار
هـــەڵپەرکێ ئـــەکـەن لە خـۆشی بـەهار
بـــە ســێهەم مـــانگی ئـــەڵێن جـۆزەردان
جـــۆ لەتـــە پـــۆلکە و نـــزار و هـــەردان
کـــاکـــۆڵی زەردی را ئـــەشەکـــێنێ
دڵـــــداران لە خـــەو را ئـــــەپەرێنێ

پـوشپەڕ یـەکـەمین مـانگی هـاوینە
گـیا وشک ئـەبێ و گـەرما بـە تـینە
عـارەق لە گـۆنای نـازوک نـازاران
ئـەباری وەکـو دوڵـۆپەی بـاران
گـەلاوێژ دووهـەم مـانگی تـاوسانە
مـانگی بـەرهەم و مـیوە رەسـانە
گـەلاوێژ هـەڵدی لە سـەر کـۆساران
کـێ بـەرکێ ئـەکا لەگـەڵ نـازداران
سـێهەم مـانگیشی کـە خـەرمانانە
کـاتی خـەرمانە و خـەلە هـەرزانـە
دەسـتەی نـازداران بـە شـنەی شـەماڵ
خەرمان شەن ئەکەن لە پای خەت و خاڵ
هـەوەڵی پـاییز پـێی ئـەڵێن رەزبـەر
رەزتـاجی زێـرین دائـەنێ لە سـەر

گـەڵای زەرد ئـەبێ بارە و بـار ئـەکـا

بـە زریـوەی زەلان لەنـجە و لار ئـەکـا

مـانگی دووهـەمی گـەڵا ڕێـزانـە

گـەڵا زەرد ئـەبێ و کـاتی خـەزانـە

کـاتی کـۆچەڵ کـۆچ پـایزە هـەوارە

خـێڵی نـازداران سـەر بەرەو خـوارە

سـێهەم مـانگیشی سـەرماوەزانـە

سەرما و سـەخڵەتە و سـەهوڵ بـەندانـە

ئـیتر چـوڵ ئـەبێ هـەوارگـەی یـاران

بـێ نـاز ئـەکـەوێ شـاخ و کـۆساران

بـەفرانـبار هـەوەڵ مـانگی زۆسـانە

کـاتی بـارینی بـەفرو بـۆرانـە

لاسـامە و بـەفرو تـەرزە ئـەخورۆشێ

هـەوارگـەی خـێڵی لەیـلا ئـەپۆشێ

بە دووهەم مانگی ئەڵێن ریبەندان
رێگا ئەبەسرێ وەک بەند و زیندان
بەڵام هەرکەسێ یاری میوانە
ریبەندانی ئەو مانگی گوڵانە
سێهەم مانگیشی رەشەمەی ناوە
مزگێنی شادی بۆمان هێناوە
ئەڵی رومەتی تەپوڵکە و نسار
خاڵ خاڵ نەخشاوە وەکو گۆنای یار
«حاڵی» پیر بوە کاتی خەزانە
بەهاریش بۆ ئەو گەڵا رێزانە

* * *

## بە ناوی خودای گەورە

## تەڵقینی کوردی، عەرەبی

باسم ربّنا ربِّ الموجوداتْ سلامی علی فخرِ الکائناتْ

و علی الآل و الصّحب الکرامْ علیهم صلاةٌ، علیهم سلامْ

بە ناوی خودای بونەوەر یەکسەر

سەلامیش لە سەر سەرداری بەشەر

هەم لە سەر ئال و ئەسحابی دیندار

یارانی دڵسۆز رەسوڵی نازدار

آمنتُ باللهْ واحدِ الأحدْ خالق الوجودْ أللهُ الصّمدْ

و محمّدٌ رسولُ الأمینْ خیرُ خلقِ الله ختمُ المرسلینْ

باوەڕم هەیە بە خودای هەستی

بە دی هێنەری بوڵندی و پەستی

وە موحەممەدیش پێغەمبەرمانە

رەسولی بەرحەق جنن و ئینسانە

آمنّا حقّاً با لأنبياءِ و بكتبِ ربِّ السّماءِ

كذا آمنت بملكهِ ملك الأرض و فلكهِ

ئیمانم هەیە بە پێغەمبەران

هەمویان حەقن نوێنەری خودان

ئیمانم هەیە بە فریشتەکانی

فریشتەکانی ئەرز و ئاسمانی

هەمویان راسن بێ عەیبن پاکن

خراپیان نیە هەمویان چاکن

آمنّا صدقاً بقضائهِ و قدره و اسمائهِ

و بخيرهِ و بشرِّهِ و بسوئهِ و ببرِّهِ

ئیمانم هەیە بە قەزا و قەدەر

بە خێر و بە شەڕ بە سود و زەرەر

بەڵام ئیختیار بە دەستی خەڵکە
گونابێ سودە چاکە بە کەڵکە
خوایا لامان دە لە نافەرمانی
ئێمە هەژارین خۆت باش ئەزانی

یا عبدَاللهِ أنتَ الميّتُ أُلقّنُکَ لکَ الرَّحمةُ
یا امةَ اللهْ أنتِ الميّتُ ألقّنکِ لکِ الرّحمةُ
یرحمکَ الله ربُّ العالمینْ ألقّنک الحقَ و الیقینْ

ئەی بەندەی خودا ئەوا تو مردی
تەڵقینت ئەکەم بە زمانی کوردی
یا خوا رەحمەتی پەروەردگارت
بباڕێتە سەر گڵ کۆی نازارت

خرجت من الدّنیا الدّنیّهْ وصلت الی دار العلیّهْ
خرجت من الدّار الغرورِ وصلت الی دار السّرورِ

دەرچوی لە ماڵی پەستی بێ وەفا

چوّیتە ناو ماڵی بەرزی با سەفا

دەرچوی لە ماڵی گومڕاهی و غورور

چوّیتە ناو ماڵی خۆشبەختی و سورور

خرجت من الدّار المحنّةِ وصلت الى دار الرّحمةِ

خرجت من الدّار المشغلهْ وصلت الى دار المعدلهْ

دەرچوی لە ماڵی پڕ لە زەحمەتت

ڕۆیشتی بەرەو ماڵی رەحمەتت

دەرچوی لە ماڵی ئاژاوە و خەفەت

چوّیتە ناو ماڵی پڕ ناز و نیعمەت

وە بیر بێنەوە عەهد و پەیمانت

بیر و باوەڕو دین و ئیمانت

بــــلێ ئــەشهەد و خـــودام أللّٰهٰ یـــە

پـــێغەمبەریشم رســـول اللّٰه یـــە

بــــلێ پـــەیمان و بـــەڵێنم وایـــە

پـــەشیمان نـــابم هـــەتا هـــەتایە

هذا آخر مأویُ دنیاک كما آخر مثویُ عقباک

هذا برزخٌ إلى القيامهْ إمّا السّعادهْ او النّدامهْ

قەبر مەنزڵگای هەی هات هەی هاتە

یـەکـەمین جـێگای هـات و نـەهاتە

قـــــەبر بـــــەرزەخەهەتا قـــیامەت

یـــا ســـەعادەتە یـــا خــو نــەدامــەت

هــــەتا قــیامەت بــەرزەخ جــێمانە

تـــەنیا کـــردەوە هـــاو ڕێـی ڕیمانە

ڕۆژی قیامەت هەڵەستینەوە
ئەبێ هەمومان زیندو بینەوە
دادگاییە بێ زیاد و کەم
یا بەرەو بەهەشت یا بۆ جەهەننەم

یوم یفرّ المرأُ من أخیهْ و من بنیهِ و صاحبتهْ
یفرّ من الأمِ و أبیهْ یا ثبورْ یا ویلْ لندامتِهْ

قیامەت سەختە نەفسی نەفسیە
هاوار بۆ کەسێ تۆشەی پێ نیە
دایک لە ڕۆڵەی ساوای ناپرسێ
هاوار بە ماڵم چەندە ئەترسێ
ئینسان را ئەکا لە دایک و بابی
لە ترسی گیان و سەختی عەزابی
دایک و باب ئەولاد بەجێ ئەهێڵن
لە ترسی گیانا حەیران و وێڵن

هیچ کەس ناپرسێ لە کەس و کاری
لە براو خـوشک و دڵسـۆز و یـاری

خوایا ڕەحمت بێ لە و ڕۆژە سەختە
ڕەحمی تـۆ نـەبێ عـاڵەم بـەدبەختە

دەبـــا داببـاریێ ڕەحـــمی کـــردگار
وەکـــو ڕەهـــێڵەی بـــارانـــی بـەهار

* * *

نکیر و مـنکر یأتـیانکَ	یسئلانک عن ایـمانکَ
یسئلانکَ عـن آمـالِکَ	و عن دینکَ و اعمالِکَ

نەکیر و مونکەر ئێستا دێن بـۆلات
نوێنەری خودان بۆ هات و نـەهات

ئـــەپرسن کـــێیە پـــەروەردگارت
بـــیر و بـاوەڕ و کـردەوە و کـارت

قلْ هو اللهُ ربُّ العالمينَ و محمّدٌ خيرُ المرسلينْ
قلِ الإسلامُ دينُنا المتينْ قُلِ القرآن إمامُ المبينْ

بلّێ خودای من ناوی أللهُ یە
رەهبەر موحەممەد رسول اللهٰ یە
بلّێ ئایین و دینم ئیسلامە
قورئان پێشەوا خەتمی کەلامە

قُلِ الْكعبةُ هى قِبْلَتُنا مِلّةُ الحنيفْ هى مِلّتُنا
قُلِ المؤمنون هم إخوتُنا و المؤمناتُ أخواتُنا

بلّێ قیبلەمان کعبة اللهُ یە
قیبلەی حەنیفە جێگای هیوایە
بلّێ پیاوان و ژنانی دیندار
برا و خوشکم بون بێ رەنج و ئازار

أَلقبرُ حقٌّ و الحشـرُ حـقٌّ     و البعثُ حقٌّ و النّشرُ حقٌّ

إنّ الصـراطَ حـقٌّ يـقينٌ     إنّ الميزانَ صِـدقٌ مـبينٌ

قەبر بـەرحـەقە حـەشر بـەر حـەقە

زیـندو بـونەوە و نـەشر بـەرحـەقە

سیرات و مـیزان بـەرحـەقن راسـن

بۆ عەدڵ و ئینساف پایە و ئەساسن

إنّ الحسابَ حقٌّ حـقيقٌ     إنّ الكتابَ صدقٌ طليقٌ

إنّ جـنّةَ النّـعيمِ حـقٌّ     و إنّ نارَ الحـميمِ حـقٌّ

بە ڕاستی حەقن حیساب و کـیتاب

هەم بۆ ئیماندار هەم ئەهلی عەزاب

راسە بـەهەشت و نـاز و نـیعمەتی

راسـە دۆزەخ و رەنـج زەحـمەتی

كُلُّ انسانٍ ما يَعْمَلْ يرىٰ

فيُحاسَبُ كُلُّ ما جَرىٰ

ئینسان ئەبینێ کردەوە و کاری

کرداری چاکی یا نالەباری

هەرچی کراوە حیساب ئەکرێ

زاڵم بە توندی عەزاب ئەدرێ

هیچ کەس بە ناحق نادرێ عەزاب

مسقاڵە زەڕرە دێتە روی حەساب

کەسیش بە پارتی بەهەشت ناسێنێ

تەنیا پاداشی چاکەی ئەبینێ

مسقاڵە زەڕرە خراپە و چاکە

حیساب ئەکرێ خودا بێ باکە

ئایەتی فمنْ یعملْ بخوێنە

مسقاڵە زەڕرە و بیر بهێنە

با باش بزانی عەداڵەت راسە

دووگومان نەبی لەم دەنگ و باسە

وەسوەسەی شەیتان دڵت رەش نەکا
با لە رەحمی خوا تۆ بێ بەش نەکا
خواگیان لە رەحمت بێبەشمان مەکە
لە سارای مەحشەر رو رەشمان مەکە
ئەی بەندەی خودای تەنیای تاقانە
تو دڵنیابە و باش بزانە
رەحمەتی خودا زۆر فراوانە
وەکو رەهێڵەی تاوی بارانە
قەت تەواو نابێ چون بێ پایانە
لا ئەبا هەرچی گونا و تاوانە
بەراستی خەڵکی چەوساوەی هەژار
عەزاب نادرێ نابینێ ئازار
هەر تنیا زاڵم عەزاب ئەدرێ
لە قیامەتا زوڵم ناکرێ
کەوایە ئەتۆیش ئەی بەندەی دڵپاک
لە دادگای حەق بێباک بە بێباک

بـلـێ خــودایـا ئـێمه هـەژار بـوین
داماوی دەستی نامۆی زۆردار بـوین
دونیامان وەکو کـونجی زیـندان بـو
دامــاوبوین مــافی ژیــانمان نــەبو
کــەوایــه نــابێ عــەزاب بـدرێن
نــابێ له قـاپیت بـێ بـەش بکـرێن
ئەولا جەهەننەم ئەم لایش هەروابێ
مــەزلوم کــوشتنه نــابێ وەهــابی
یاسای عـەدالـەت بـێ گـومان وایـه
مــەزلوم نــاسوتێ هــەتا هــەتایه
عــەزاب هــەر تــەنیا بـۆ زالـمانه
ئەگەر نەوبەیش بێ نەوبەی ئـەوانـه
خــوشک و بـراکـانم دلسۆزەکـانم
ئــارامــی گــیانم روحــی رەوانــم
ئــەم دونـیا هـیچه ئـاخرمان مـەرگه
هەموی وشک ئەبێ ئەم دار و بەرگه

بێجگە لە خودا هیچ کەس نامێنێ
خودا حەقی کەس قەت نافەوتێنێ
کەوایە وەرن با هەمو چاک بین
لەگەڵ یەکترا دڵسۆز و پاک بین
تا لە قیامەت خەجاڵەت نەبین
بێ بەش لە رەحم و عەداڵەت نەبین
خودایا حەڵقەی ئاستانەت ئەگرین
دەس هەڵ ناگرین تا کاتێ ئەمرین
خوایا ببەخشە زیندوو مردومان
گونا و تاوانی رۆی رابردومان
ئامین خواگیان قەبوڵ بێ لە لات
بڵێن فاتحە مع الصّلوات

❊ ❊ ❊

## پاڕانەوە

ئـەی خـوای گـەورە بـێ وێـنە و تـەنیا
بــەخشەندەی گــونای ئـێمەی روسـیا
دەخـــیل سـەد دەخـیل بـەڕوی سیاوە
هـــانا و پـــەنامان بــۆ تــۆ هــێناوە
هــەر درگـــای تـۆیە جـێگای هـانامان
هــەر قـــاپی تــۆیە ڕێگـــای پـــەنامان
بـــیکە بـــە خـــاتر گـــەورەیی زاتت
بـــە بـــێ وێـــنەیی زات و ســـیفاتت
خــۆش بـە لە گـونای ئـێمەی گـونابار
ڕەحمی خێرت بـێ بـۆ ئـێمەی هـەژار
بـــە شـــەرافـــەتی ڕەســـوڵی نـــازار
سەرداری عـاڵەم شـای بـۆراق سـەوار

بـــێ ئـیمان نـەبین کـاتی گـیان کـێشان

لە قـــەبری تـــەنگا نـــەبین پـــەرێشان

بـــە زاری نـــوح و عـــیشقی ئـیبراهـیم

بە عـیسای دڵسـوز بـە مـوسای کـەلیم

لە قـــەبری تـــەنگا روســـیا نـــەبین

نـــەبین بـــە پـــەیڕەو شـــەیتانی لەعـین

بـــیکە بـــە خـــاتر عـــەرشی بـــەرینت

بـــە فـــریشتەکـــانی پـــاک و شـیرینت

کـاتی مـەحکەمەی نـەکـیر و مـونکەر

کەڕولاڵ نەبین دەک خاکمان بـە سـەر

بـە فـریشتەکـانی عـەرشی رەحـمانت

بـــە ســـۆزو نـــاڵەی ئـــەهلی ئـیمانت

لە غـــوربەتخانەی قـــەبری نـاهەموار

نـــائومید نـــەبین هـــاوار ســـەد هـاوار

بە نالە و سۆزی ئەهلی مەیخانەت

بە یاهو یاهوی قاپی و ئاستانەت

کەروڵاڵ نەبین لە قەبری تەنگا

سەر و سورەتمان نەدا بە سەنگا

بە ئاه و ناڵەی شەوبێدارانت

بە قاورمەی دڵ دۆس و یارانت

لە سارای مەحشەر نەبین چاو لەبەر

نائومید نەبین لە ئاوی کەوسەر

بە قرچە و کزەی جەرگی خاسانت

بە لافاوی چاو خواناسانت

لە سارای مەحشەر نەبین سەرگەردان

نەبین بە هاو ڕیز هەناسە سەردان

بە ڕاستی و پاکی پیغەمبەرانت

بە سۆزو زاری ئەویندارانت

لە سارای مـەحشەر نـەبین خـەجاڵەت

روســـیا نـــەبین ڕۆژی قـــیامەت

بە چوار یاری پاک گەورە و مـوعتەبەر

بوبەکـرو عـومەر عـوسمان و حـەیدەر

ڕەحمت بێ ڕەحمت لە حـیساب نـایە

پـــایانی نـــیە هـــەتا هـــەتایە

بـــە نـــاڵەی حـەسەن لە ئێشی جگـەر

نە خۆینی گوڵڕەنگ حوسەینی سەروەر

ڕەحمت بێ ڕەحمت دەریای بێ پـەیە

بـۆ هـەموکەسێ بـوەو هـەر هـەیە

بـە ئـاڵ و بـەیت و یـارانـی دیـندار

هـــاو ڕازەکـانی ڕەسـوڵی نـازدار

بارانـی ڕەحـمت وەک هـەوری بـەهار

ڕامـــاڵی گـــوناى ئـێمەی گـونابار

بـــه تـــابیعین و ئـــەولیای ئـــەخیار

بـــه غـــەریبانی تـــەبعیدی و هـــەژار

ڕەحمت بێ بـه حـاڵ ئێمەی بێچاره

دامـــاوی دەسـتی نـــەفسی ئـــەماره

بـــه نـــەزمی شیرین ئـایەی قـورئانت

بـــه کـــتێبەکـــانی پـــێغەمبەرانت

ڕەحمی خێرت بێ ئـامان سـەد ئـەمان

کـــەریمی کـــارساز دەستم بـه دامـان

به ئـەهلی شـەرع و وەرع و حـەقیقەت

ئـەهلی حـەدیس و ڕێگـای تـەریقەت

ڕەحـــمت بـــێ ئـێمه بێ دەسەڵاتین

چـــاوەڕیی ڕەحـمی قـاپی و درگـاتین

«حاڵی» ئەڵقەکـەی ئـاستانەت ئـەگرێ

دەس‌بـــەردار نـــیه تـا وەختی ئـەمرێ

شــەرتی کــردوە تــا ئــاخر نــەفەس

ئــەڵقەی ئــاستانەت بــەرنادا لە دەس

ســەلات و ســەلام بــێ حــەدد و ژمــار

وەکـــورە هــێڵەی بــارانــی بــەهار

بـــبارێتە ســـەر ڕەســـوڵی نــازدار

ئــال و ئــەسحابی دڵســۆز و دیــندار

ئــامین خــودایــا قــەبوڵ بــێ لە لات

بــڵێن فــاتحە مــع الصّــلوات

عەلی سەعادەتی (حاڵ)

# موعەللیم

ئەی موعەللیم وارسی بەرحەققی زانین و هونەر

ئەی چرای روناکی عالەم پێشەوای نەوعی بەشەر

ئەی موعەللیم رەهنەمای دڵسۆزی ئایین و ئەوین

ئافەرین ئەی نوری هەستی ئیفتخاری دین و ژین

ئەی موعەللیم ناخودای کەشتی لە گێجاوی خەتەر

شەمعی رێگای راستی ئەی گەوهەری سەرتاجی سەر

تۆی وەفادار تۆی فیداکار تۆی ئەویندار یەقین

ئافەرین سەد ئافەرین ئەی رەورەوەی چەرخی زەمین

گەج لە دەستا دێتە تەسبیحات و خەندە و پێکەنین

بانگ ئەدا هاوار ئەکا زانین هەزاران ئافەرین

روی سپی تەختە سیا مەشغولی زیکرە و مەرحەبا

تەختە پاک کون شەرمسارە دەست و خەتت لابا

چـــی بـــڵێم تـاریفی تـۆ زۆره تـەواو نـابێ سـەنات

پـــای قـەڵەم کـۆتایە ڕێگـا دوره قـەت نـاگـاتە لات

نەی هەمو پێنوسی تـۆبێ و ئـاوی دەریـا جـەوهەره

کاغەز و پەرتوکی دونیا گشـتی لات بـێ یـەکسـەره

جـــنن و ئـــینسان و فـــریشته بـــبنه یـــار و یـــاوەره

بۆ سەناو مەدحی موعەللیم هەر کـەمە ئـەم دەفـتەره

حاڵی لەم مەیدانە هـەرچـی دەم بـدەی هـێشتا کـەمە

ڕای سەفەر دور و درێژه ڕوخسـەتی قـەسر و جـەمە

## ئەویینداری

لە خۆر پرسیم لە بەرچی گیانە وێڵی
شەوو رۆژ وا خەریکی گەشت و گێڵی
وتی بۆ دیتنی روخساری یارم
وەکو عاشق هەمیشە بێ قەرارم
منم عەودالەکەی دیداری ئەحمەد
بڵێن سەڵوات بە روخساری موحەممەد
لە مانگ پرسیم لە بەرچی بێ قەراری
دەمێ هەڵدی و دەمێکیش نادیاری
وتی پەروانەکەی شەمعی جەماڵم
دەمێ رونە و دەمێتر تارە باڵم
منم پەروانەکەی روخساری ئەحمەد
بڵێن سەڵوات بە دیداری موحەممەد

لە گوڵ پرسیم لە بەرچی ڕەنگە سورە

سەر و زولفت هەمو عەتر و بوخورە

وتی حاڵی هەمو ئەم عەتر و بۆمە

خەڵات و پێشکەشی دلداری خۆمە

منم گوڵ دەستەکەی گوڵزاری ئەحمەد

بڵێن سەڵوات بە ڕوخساری موحەممەد

وتم بولبول لە بەرچی تۆ ئەناڵی

خەریکی ساز و ئاهەنگ و خەیاڵی

وتی بۆ یارە ئەم ڕاز و نیازە

بەهانەی عیشقە ئەم ئاهەنگ و سازە

منم دیوانەکەی گوڵزاری ئەحمەد

بڵێن سەڵوات بە دیداری موحەممەد

ئەتۆیش حاڵی وەکو بولبول بخوێنە

لە گولزاری ئەوینا گوڵ بسێنە

ببە گوڵچینەکەی گوڵزاری یارت

بە هیوای رەحمەتێ بۆ حاڵی زارت

ببە بولبول لە ناو گوڵزاری ئەحمەد

بڵێن سەڵوات بە دیداری موحەممەد

عەلی سەعادتی